## وەرزی یەکەم

### گشتی

١- **چوارچێوەی کار (النطاق)**

فەرمانە جێگیرەکان سەرجەم ئەو فێرکاری و یاسایانە دەگرێتەوە کە پێویستە کارمەندانی ئەو فەرمانگەیەی کە تیایدا کاردەکەن ئەنجامی بدەن و خۆیان بەبەرپرسیار بزانن بەرامبەر ئەو ئەرکانەی بۆیان دیاری کراوە.

٢- **مەبەست (الغرض)**

دانانی دەقێکی دیاریکراوی جێگیرە، دەبێتە سەرچاوە و مەرجەعی کارکردن، لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ دامەزراوەکە و بارودۆخی ناوچەیی دەگونجێت.

٣- **ناوەڕۆکەکان (المحتويات)**

أ- سەرجەم ئەو فەرمانە جێگیرانە کە لە گۆڕەپانە جیاوازەکاندا کاریان پێدەکرێت دەگرێتەوە، کە لەپێناوئەم جیاوازییە دانراون، بۆ نمونە: هەندێك لە بیاباندا کاردەکەن و، هەندێك لە ناوچەی شاخاویدا کار دەکەن.

أ- فەرمانە جێگیرەکان بۆ ڕوبەڕو بونەوەی داوکاریەکان لەکاتی ئاشتی و جەنگدا پیادە دەکرێت، یان ئەوەیە کە تەنها لە پێناو جەنگدا و لە میانەی کارکردنی جێگیردا دەردەکرێت.

ب- هیچ ناونیشان و ڕیزبەندییەکی پێوانەیی نییە بۆ ئەم فەرمانانە، فەرمانە جێگیرەکان تایبەتە بە بارودۆخی ئاشتی و جەنگ، کارکردن لە کاتی ئاسایی و، بابەتی تەندروستی و، پاکوخاوێنی و، چاودێری پزیشکی و دابەشکردنی کارەکان...هتد.

٤- **پیادەکردن (المهمة)**

ئامادەکردنی سیاسەت و پلانی مەشق بەوەی کە بەڕێوەبەری ئەو دامەزراوەیە بڕوای پێی هەیە لە مەشقی هاوبەشی و گەشەپێدانی بیروباوەڕی سەربازی و، سەرپەرشتیکردنی کارەکان بە پێی توێژینەوە ستراتیژیەکان بەپێی ئەو داواکاریانەی هێزە هاوبەشەکان دەیگرنەبەر بۆ پیادەکردنی ناوەڕۆکی سیاسەتی وەزارەت، لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجە سەربازییە نیشتمانییەکان.

٥- **ئەرکەکان (الوظائف)**

أ- ڕاوێژکردن بە سەرۆکی ئەرکانی سوپا و بریکارەکەی لەسەر ئەو کارانەی پەیوەندیان بە کاروباری مەشق و بیروباوەڕی سەربازییەوە هەیە (العقيدة العسكرية).

ب- دانانی سیاسەت و پلان و بەرنامەیەك پەیوەندی بە ڕاهێنان و فێکردن و باوەڕەوە هەیە بەگوێرەی ئەو داواکاریانەی ئۆپەراسیۆن هەیەتی

ت- بەڕێوەبردن و پیادەکردنی مەشق و فێرکردن لە بواری ڕاهێنان لەناو دامەزراوە و پڕۆسەکانەوە هەیانە، بەئامانجی گەشەپێدانی تاك و درێژەدان بە ئامادەکاری جەنگی.

پ- بونیات نان و گەشەپێدانی باوەڕی سەربازی لە ئاستی ستراتیژی و، پڕۆسە و، خۆسازدان (التعبئە).

ج- دامەزراندن و گەشەپێدانی بەرنامەی فێرکردن و هەڵسەنگاندن لە پێناو گەشەپێدانی بنەماکانی فەرماندەیی سەربازی بۆ هێزە هاوبەشەکان.

ح- دابینکردنی بنەما مادییەکان بۆ ڕاهێنانکردن بە هێزە هاوبەشەکان.

خ- بەڕێوەبردنی توێژینەوە پەیوەندی دارەکان بە ستراتیژی ئاسایشی نیشتمانی و ستراتیژی سەربازی، لەسەر ئاستەکانی سەرەتایی و ناوەندی و درێژ خایەن.

## وەزی دووەم

**ڕێکخستنی لیوا**

١- **سەیری پاشکۆی ژمارە (أ) بکە بۆ ڕێکخستنی لیوا**

٢- **پێکهاتەی بارەگا**

**بارەگای لیوای پیادە پێك دێت لە فەرماندەی لیوا و هەیئەی ڕوکن کە وەك ڕاوێژکاری فەرماندەی لیوا بۆ ئەو کاروبارانەی بۆیان دیاریکراوە و پسپۆڕی خۆیانە.**

٣- **بارەگای لیوای ئاسایی پێك دێت لە:**

أ- **دەستەی فەرماندەکان**

**یەکەم: فەرماندەی لیوا.**

**دووەم: دەستەی پابەندکردن (الانضبات).**

**سێیەم: دەستەی پا سەوانی.**

ب- **دەستەی ئەرکانی گشتی**

**یەکەم: پێشەوای لیوا.**

**دووەم: ئەفسەری ڕوکنی جوڵان.**

**سێیەم: ئەفسەری ڕوکنی مەشق.**

**چوارەم: ئەفسەری ڕوکن بۆ کاروباری سەربازی.**

**پێنجەم: ئەفسەری مەشقی جەستەیی.**

**شەشەم: ئەفسەری ڕوکن کیمیاوی.**

**حەوتەم: ئەفسەری ڕوکنی هەواڵگری.**

**هەشتەم: ئەفسەری ڕوکنی ئاسایش (الامن).**

ت- **بەڕێوەبردن و میرە**

پ- **یەکەم: یاریدەدەر.**

ج- **دووەم: ئەفسەری ڕوکنی میرە.**

ح- **سێیەم: ئەفسەری ڕوکنی گواستنەوە و گەیاندن.**

د- **ڕاگەیاندن و ئاراستەکردنی مەعنەوی**

یەکەم: ئەفەسەری ڕاگەیاندن.

دووەم: ئەفسەری ئاراستەکردنی مەعنەوی.

أ- ڕاوێژکاری یاسایی

ڕاوێژکاری یاسایی یاریدەدەر.

س- ژمێریاری

ئەفسەری ژمێریاری.

ز- یەکەکانی لیوا

یەکەم: فەوجێکی یەکی پیادە.

دووەم: فەوجی دووی پیادە.

سێ فەوجی سێی پیادە.

چوار: ب خ/ ٣.

پێنجەم: سمغ اللواء.

شەشەم: سریەی پەیوەندییەکان.

١- **کارمەندی فەرمانگەی مەشق:**

أ- **بارەگای مەشق لەمانە پێك دێن:**

**یەکەم. بریکاری سەرۆکی ئەرکانی سوپا بۆ کاروباری مەشق.**

**دووەم. پشکنەری سەربازی.**

**سێیەم. بریکاری پشکنەری سەربازی.**

**چوارەم. ئەفسەری ڕوکنی پشکنەری سەربازی.**

**پێنجەم. ڕاوێژکاری یاسایی.**

**شەشەم. بەڕێوەبەری ڕاوێژکاری یاسایی لە پێشتر (الاقدم).**

**حەوتەم. بەڕێوەبەری ڕاوێژکاری یاسایی.**

**هەشتەم. ئەفسەری کارگێڕی.**

**نۆیەم. ئەفسەری ڕوکنی تایبەتی.**

**دەیەم. سەرۆکی تێبینەران.**

أ- **بارەگای ئەمیندار (أمین السر) پێك دێت لە:**

**یەکەم. بڕواپێکراوی فەرمانگەی ڕاهێنان.**

**دووەم. ئەفسەری ڕوکنی ڕێکخەر.**

**سێیەم. تێبینەر.**

ب- **بەشەکانی بەڕێوەبەرایەتی پێکدێن لە:**

**یەکەم. بەشی کارگێڕی (تد/١)**

**دووەم. بەشی جوڵان و هەواڵگری (تد٢/تد٣)**

**سێیەم. بەشی میرە (تد/٤)**

**چوارەم. بەشی پلاندانان (تد/٥)**

**پێنجەم. بەشی پەیوەندییەکان (تد/٦)**

**شەشەم. بەشی مەشق (تد/٧)**

**حەوتەم. بەشی دارایی (تد/٨).**

ژ- **هەر بەشێك لەمانە کۆمەڵێك پۆل دەگرێتەوە ئەفسەری ڕوکن کە کاروبارەکان ڕادەپەڕێنێت فەرمان لە ئەستۆیە (مكلف) بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتییەکان.**

أ- **پەیکەری ڕێکخستنی پاشکۆ (أ).**

ب- **پەیوەندییەکان:**

**فەرمانگەی مەشق بە سەرۆکایەتی سەرۆك ئەرکان پەیوەندی بەسەرجەم لاینەکانەوە هەیە.**

## وەرزی سێیەم

## ئەرکەکان (الواجبات)

١- **ئەمینداری تایبەتی لیوا**

أ- ئەفسەرێکی ڕوکمی یاریدەر و، نهێنی پاریزی، ئەرکی ئەو نییە دەست تێوەردان بکات لە کاروباری بەڕێوەبەردندا، بەلاَم هەرکارێك ڕوبدات ببێتە هۆی دروستکردنی کاریگەری لەسەر بەڕێوەبردن ڕایدەگەیەنێت.

ب- ئەمینداری مەشق سەرۆکی دەستەی ڕوکنی فەرمانگەی مەشق، کە لەمیانەیەوە ئەتوانیت پشتگیری و پشتیوانی بۆ بریکارەکان دەربڕێت لە هەموو ئەرکەکانیاندا.

ت- هەوالگری هەڵدەستێت بە هەماهەنگی و کۆنترۆلکردنی هەموو ئەوەی ئاراستەی دەستەی ڕوکنی دەکەیت، بەرپرسە بەرامبەر مەشق لە بەڕێوەردنی فەرمانگەکە.

پ- کارەکانی لە میانەی بەشەکانە بە گوێرەی ئەو فەرمانانەی کە بەڕێوەبەرایەتی دەری دەکات.

ج- بەرپرسە لە سەلامەتی سەرجەم کارەکان و، نوسراوەکان و، تۆمارەکان و گەشەپێدان بە سەرجەم بەشەکان

ح- سەرپەرشتی و بەدواداچون بۆ سەرجەم کارەکانی بەڕێوەبردن و بەرزکردنەوەی ڕاپۆرتەکان بۆ یاریدەرێت لەسەر پێداویستییەکانیان.

خ- هەڵدەستێت بە پکشنینی سەرجەم بەڕێوەبەرێتییەکان بە هاوکاری پشکنەری سەربازی.

د- بەرپرسە لە ڕێکخستنی مەوعیدەکان و پەیوەندیەکانی بەڕێوەبەرایەتی.

ژ- بەرپرسە لەسەر ڕێکخستنی پەیوەندییەکان لەگەڵ سەروی خۆی.

## ٢- پشكنەری سەربازی

أ- بە ڕاوێژكاری بەڕێوەبەرایەتی سەرۆكایەتی ئەركانی سوپا دادەنرێت بۆ كاروباری مەشق، لەسەرجەم بوارەكانی پەیوەندی دار بە پشكنین و جۆرەكانی.

ب- بەستنی كۆڕ و كۆبونەوە و سیمینار لەگەڵ بەرپرسە سەربازییەكانی بەڕێوەبەرایەتییەكان بۆ دەركردنی زانیاری و ئاراستەكردن بەڕێز بەڕێوەبەر كە هاوكاری دەكات بۆ دانانی نەخشەی پكشنین.

ت- دەركردنی خشتەی پشكنین كە كە لەلایەن پشكنەری سەربازییەوە فەرمانگەوە دیاری دەكرێت و كاتی سەردانی پشكنینەكە بە بەڕێوبەرایەتییەكە دەڵێت.

ب- دیاریكردنی كۆمەڵێك پشكنەر و نوسینی ناوی ئەو لیژنانەی كە پشكنین و دابەشكردنی كارەكان ڕێك دەخەن.

ت- بە گوێرەی ئەو یاسا و بنەما بڕیار لەسەردراوانە پشكنینەكە ئەنجام دەدات.

پ- ئامادەكردنی ڕاپۆرتی پشكنینی بەڕێوەبەرایەتییەكان نیوەی ساڵ و، خستنەبەردەستی بەڕێوەبەرایەتی بۆ ئەوەی هەڵوەستەی بەڕێوەبەرایەتییەكان بخاتە ڕوو، بزانێت ئامادەییان چەندە.

ج- چاودێریكردنی ئەو فەرمانگانەی لە ژێر سەرپەرشتی ئەمدان بۆ ئەوەی بزانێت خاڵی لاوازیان چییە و، لە میانەی پشكنینەكەوە خاڵە زۆر لاوازەكەیان بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی چارەسەری بكەن.

ح- بەستنی كۆنگرە لە كۆتایی هەموو پشكنینێكدا، بۆ ئەوەی بزانن دەر ئەنجامی پشكنینەكان چییە.

خ- بەرزكردنەوەی ڕاپۆرتی پشكنینی ساڵانە و نیوەی ساڵ كە لەلایەن پشكنەری سەربازی فەرمانگەكەوە دوای ئەوەی بەڕێز بەڕێوەبەرایەتی فەرمانیان پێدەدات ئەنجامی دەدەن و بەرزی دەكەنەوە بۆ پشكنەری گشتی سەربازی.

د- بە ئاگەداری بەڕێوەبەرایەتی سەرجەم ڕاپۆرتی پشكنەرە سەربازییەكان یەك دەخەن و، بەرزی دەكەنەوە بۆ پشكنەری سەربازی گشتی.

ژ- هەستان بە پشكنینی مانگانە بۆ بەشەكانی فەرمانگە و، بەرزكردنەوەی ڕاپۆرتی پكشنینەكە بۆ بەڕێز بەڕێوەبەر سەرۆكی ئەركان بۆ كاروباری مەشق.

ر- سەرپەرشتیکردنی ئامادەسازی سەرجەم بەشەکان و جومگەکانی فەرمانگە بۆ ئەوەی ئامادەبن بۆ پشکنین لەلایەن پشکنەرایەتی گشتییەوە.

ز- ئاگادارکردنەوەی بەڕێز یاریدەری گشتی بە سەرجم مەوعید و وادەی پکشنینی بەڕێوەبەرایەتییەکانی سەر بەو فەرمانگەیە.

س- ئاگادارکردنەوەی بەڕێوبەرایەتییەکانی سەر بەو دەزگایە بەماوەیەکی کەم بۆ ئەوەی خۆیان ئامادەبکەن بۆ پشکنینەکە.

ش- لە ژێر چاودێری و بەئاگای بەڕێز بەڕێوەبەر دەبێت سەرجەم فەرمانەکان دەربچێت لە پشکینین سەربازی گشتی و، پشکنەری گشتی و هەموو ئەو بابەتانەی پەیوەندییان بە پشکنینەوە هەیە.

ص-دەبێت بەڕێز بەڕێوەبەر ئاگای لەسەرجەم ئەو کێشە و ئاستەنگانەبێت ڕوبەڕوی دەبێتەوە لە بەڕێوەبەرایەتییەکان لە ماوەی پشکنیندا و، پێدانی پێشنیار بۆ لەناوبردنی.

چ- دەبێت وەك بازنەیەکی گەیەنەربێت لە نێوان بەڕێوەبەرایەتییەکان و پشکنەری گشتی سەربازی، بەپێی ئەو فەرمانانە کاربکات کە هاتوە لەسەر پشکنین و ڕاگەیاندنی فەرمانی پشکنینی گشتی.

گ- سەپەرشتیکردنی سەرجەم ئەو خولانەی کە بەڕێوەبەرایەتی پشکنینی ئەنجامی دەدەن، لە پشکنینە سەربازییەکانیان.

ڤ- ئامادەکردنی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی پەیوەندیدار بەکاروباری پشکینینەوە، بە پشت بەستن بە ڕاپۆرتی پشکنین و کۆنگرە و شیکاری ئەو تێبینیانەی دەینوسنەوە و دەبێتە هۆی گەشەدان بە پشکنین و بەرزکردنەوەی ئاستی لێهاتووی بەڕێوەبەرایەتییەکان و پیادەکردنی ئەرکەکانیان.

ع- سەرپەرشتی کارەکانی ئەفسەری ڕوکنی پشکنین لە فەرمانگەی مەشق و چاودێری جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیان و هەڵسەنگاندنی تواناکانیان.

غ- بەرپرسە بەرامبەر ئەو ئاراستانەی بەڕێز یاردەری سەرۆکی ئەرکانی سوپا دەری دەکەن بەرامبەر بە پیادەکردنی سەرجەم فەرمانەکانی سەروخۆی.

٣- **بەڕێوەبەری پشکنەری سەربازی**

**أ- یاردەدەری سوپا لە جیاتی پشکنەری سەربازی بەرفەرمانە (المكلف) بەرامبەر هەموو ئەو ئەرکانەی لە دەرەوەی فەرمانگەی مەشق پێی دەسپێردرێت و بەرپرسە بەرامبەر بەڕێز یاردەری سەرۆکی ئەرکانی سوپا بۆ مەشق و سەرجەم ئەرکەکانی پشکنەری سەربازی.**

**ب- یارمەتی پشکنەری سەربازی دەدات لە پشکنینی مانگانەی بارەگای فەرمانگەی مەشق**

**ت- چاودێری هەموو ئەو پشکنینانە دەکات کە مانگانە بەڕێوەبەرایەتییەکان ئەنجامی دەدەن و ڕاپۆرتی پشکنین ئامادە دەکات بۆ پێشکەشکردنی بۆ پشکنەری سەربازی.**

**پ- هاوکاری پشکنەری سەربازی دەکات بۆ خۆ ئامادەکردنی بەڕێوەبەرایەتییەکان و بارەگای فەرمانگەکە بۆ پشکنینی سەربازی گشتی و پشکنەری گشتی.**

**ج- یەك خستنی ڕاپۆرتی نیوەی ساڵانە و ساڵانە کە لەلایەن پشکنەری سەربازییەوە لە فەرمانگەکەیان ئەنجام دراوە.**

**ح- ڕادەستکردنی پۆستە هاتووەکانی پەیوەندی بە کاروباری پشکنین**

**خ- هاوکاری پشکنەری سەربازی لەبەستنی کۆنگرەی شیکاری لە کۆتایی پشکنینی ساڵانە کە پشکنەری سەربازی پێی هەڵدەستێت**

**د- پێداگری پشکنەری سەربازی بکرێت بۆ فەرمانگەکەی بە سەرجەم پشکنینەکانەوە و بەرزرکردنەوەی ڕاپۆرتی هەستان بە ئەرکەکانیان لە دەرەوەی بازنەی مەشق.**

**ژ- چاودێری کات و بەرواری یەکبینین و خۆ ئامادەکردنی سەرجەم پێویستییەکانی پشکنین بەماوەیەکی کەم بەر لە پشکنینەکە و ئاگادارکردنەوەی پشکنەری سەربازیی**

**ر- بەرپرسیارە بەرامبەر پشکنەرە سەربازییەکان بە پیادەکردنی سەرجەم ئەو ئەرکانەی لەسەرەوە هاتوون.**

٤- <u>ئەفسەری ڕوكن</u>

أ- لە جیاتی بەڕێوەبەری گشتی پشكنەری سەربازی هەڵدەستێت بە ئەركەكانیان لە كاتێكدا ئەركێكیان لە دەرەوەی فەرمانگە پێ بسپێردرێت.

ب- یاریدەدری پشكنەری سەربازی دەبێت لە هەموو ئەو شتانەی پەیوەندی بە پشكنینی سەربازییەوە هەیە كە تایبەتە بە مەشق و بەڕێوەبەرایەتییەكان.

ت- یاریدەری یاردەرێتی پشكنینی سەربازیی دەبێت لە ئامادەكردنی ڕاپۆرتی پشكنینی بەڕێوەبەرایەتییەكان و یەك خستنیان.

پ- كاردەكات لەگەڵ بریكاری پشكنەری سەربازی لەسەر چاودێریكردنی كاتی پشكنینەكان و ئامادەسازی پێداویستییەكانی پشكنین.

ج- ئاراستەكردنی ڕاپۆرت بۆ پشكنەری سەربازی بۆ فەرمانگەی مەشق لەكاتی پشكنینی هەر بەشێك یان هەر بەشێك و، بەڕێوەبەرایەتییەك.

ح- پابەندبون بەسەرجەم فەرمان و دیسپلینەكانەوە بۆ ئەنجام هەركارێك لە كاتی پشكنین پێی هەڵدەستن.

خ- پێشكەشكردنی وتار و ئامۆژگاری بۆ سەرجەم كارمەندانی فەرمانگەی مەشق بۆ تێگەیاندن لە چەمكەكانی دیسپلین ئەو بنەمایانەی كە پشكنینەكان پشتیان پێ دەبەستن و، تەواوی ڕێوشوێنەكانی دیكە.

د- بەرپرسە بەرامبەر پشكنین فەرمانگەی مەشق و پیادەكردنی سەرجەم ئەو فەرمانانەی لەسەرەوە هاتووە.

٥- <u>ڕاوێژکاری یاسایی</u>

أ- ڕاستەوخۆی پەیوندی بە بەڕێز یاریدەری سەرۆکی ئەرکان بۆ کاربورای مەشقەوە هەیە.

ب- پێشکەشکردنی ڕاوێژی یاسایی بۆ بەڕێز جەنابی یاریدەری گشتی.

ت- چاودێریکردن و کورتکردنەوەی تەواوی ئەو دانیشتنە لێکۆڵینەوانەی فەرمانگەی مەشق و بەڕێوەبەرایەتییەکانی دیکەی پەیوەندی دار پێیەوە.

پ- بەبەردەوام چاودێری تۆمارە یاساییەکان بکات و، گرنگیان پێبدات و، نوێیان بکاتەوە.

٦- <u>ئەفسەری ڕوکنی تایبەتی</u>

أ- گرنگیدان بە تۆماری وادەکانی (الموعید) بەڕێوەبەر و بەبیرهێنانەوە.

ب- ئامادەکردنی پەیڕەوی (المنهج) حەفتانە بۆ چالاکییەکانی فەرمانگە و ئەوەی پەیوەندی بە بەڕێوەبەرایەتییەوە هەیە.

ت- پارێزگاری کردن لەو ئەرکانەی کە خراوەتە ئەستۆی لە بەشەکانی فەرمانگە و کورتکردنەوەیان.

خ- ڕێکخستنی کۆبونەوەی یاریدەر و ئەو کەسانەی کە ئامادەدەبن لای.

د- بەرپرسە لە پاراستنی هەموو تۆمار و بەڵگەنامەکان، بە مۆڵەتی یاردەدەر نەبێت ڕێگە بەکەس نەدات سەیری بکات.

٧- بەڕێوەبەری بەشی کارگێڕی

أ- لێپرسراوی بەشی کارگێڕی و بەڕێوەبردنە، هەڵدەستێت بە ئەنجامدان و ئاراستەکردنی سەرجەم چالاکییەکان بەشەکەی و بەرپرسە بەرامبەر سەروخۆی لەسەر کارەکانی.

ب- پێشکەشکردنی ڕاوێژ بۆ یاریدەدەر لەسەر کێشە تاکەکان.

ت- دابینکردنی نوێترین زانیاری و بەردەوام نوێکردنەوەی زانیارییەکانی فەرمانگەی مەشق.\

پ- هەماهەنگی لەگەڵ فەرمانگەی بەڕێوەبردن و ئەو بەڕێوەبەرانەی تایبەن بەمن تایبەت بە کێشە تاکییەکان.

ج- پێشکەشکردنی ڕاوێژ بە یاریدەدەر و هەیئەی ڕوکن دەربارەی ئەو کێشانەی تایبەتن بە قەرەبوکردنەوەی کەسەکان.

ح- بەرپرسە بەرامبەر ڕێکخستنی زانیاری تاکی سەرجەم سەرباز و مەدەنییەکانی سەر بە فەرمانگەکەی.

خ- سەرپەرشتی سەرجەم کێشەی ئەو کەسانە دەکات لە ناو فەرمانگەکەی.

د- ڕێکخستنی هەموو ڕاپۆرتەکان کە تاکەکانی پێ هەڵدەسەنگێنێت لە فەرمانگەکەی.

ژ- هەڵدەستێت بە بلاو کردنەوەی سەرجەم ئەو ڕودا و ئەو کەسانەی سزا دراون لە ناو فەرمانگەکەی.

ر- چاودێری سەرجەم ئەو فەرمانانەی وەزارەت دەکات کە تایبەت بە پلەبەرزکردنەوە و دامەزراندن و پێدانی پلە.

٨- **<u>ئەرکەکانی بەشی هەوالگری و جولان</u>**

**أ- بەرپرسی بەشی جولان و هەوالگری هەلدەستن بە هەماهەنگی و کۆنترۆلکردنی سەرجەم ئەو چالاکیانەی کە لە ناو بەشدا ئەنجام دراوە و، بەرپرسە بەرامبەری هەمو ئەو ئەرکانەی پێی سپێردراوە.**

**ب- بەرپرسە بەرامبەر پلان دانان و ڕیزکردنی کارە لە پێشینەکانی و، پڕۆسەی هەوالگری لە ناو بارەگاکانی فەرمانگەی مەشق و دابینکردنی پشتیوانی هەوالگری.**

**ت- پێشکەشکردنی ڕاوێژ بە یاریدەرێت بەهۆی ئەفسەری ئەمیندار لەسەر کێشە ئەمنییەکان.**

**پ- بەرپرسە بەرامبەر یاردەرێتی دەربارەی پلاندان و ئەنجامی دانی کارە هەوالگریە لە پێشینەکان.**

**ج- گرنگیدان بە پەیوەندییە هەوالگرییەکان لەگەل بارەگای بالاو بەرپرسەکانیان.**

**ح- دابینکردنی نەخشە و گرنگی پێدانی و نوسین لەسەری.**

**خ- سەرپەرشتی سەرجەم ئەو ڕێوشوێنە ئەمنیانە دەکات کە لە ناو فەرمانگە ئەنجام دەدرێت.**

**٩- ئەرکەکانی بەڕێوەبەری بەشی میرە**

أ- بەرپرسە بەرامبەر ئاراستەکردن و هەماهەنگی و کۆنترۆڵکردنی هەموو ئەوانەی لەبەردەستییەتی بەرامبەر ئەمینداری فەرمانگەکەی.

ب- لە ڕێگەی ئەمیندارەوە ڕاوێژ پێشکەش بە یاریدەر دەکات

ت- پێشکەش کردنی پلانی ساڵانەی میرە بۆ فەرمانگەی سەر و خۆی بە هەماهەنگی لەگەڵ بەشی مەشق و فێرکردن.

پ- شیکاری داواکارییەکانی مەشق و فێرکردن بۆ مەبەستی دیاریکردنی ئەو مادانەی کە پێویستن بۆ پشتیوانی مەشق و فێکردن لە لە ئەکادییە سەربازی و دامەزراوەکانی مەشق بەکاری دەهێنن.

ج- نوێکردنەوەی هەڵوێستی تایبەت بە میرە بۆ سەرجەم یەکەکانی پەیوەست بە یەکە پەیوەندی دارەکانی فەرمانگەکە.

ح- دانانی پلان بۆ بوژانەوەی ژێرخانی ئابوری فەرمانگەی مەشق.

خ- چاودێکریکردن بۆ دڵنیابون لە داواکاریەکانی مەشق بۆ ۆسەرجەم دامەزراوەکانی مەشق.

د- بەڕێوەبردن و کارگێڕیدانی هۆکارەکانی گواستنەوە و کۆنترۆڵکردن دانانی پلان و هەماهەنگی لەگەڵ سەرجەم ئەو کاڵانەی دەگوازرێنەوە، بەپەلەبێت یان بە ئاسایی بگوازرێنەوە.

١٠- **ئەرکەکانی بەڕێوەبەری بەشی پلاندانان**

أ- هەڵدەستێت بە ئاراستەکردن و هەماهەنگی کردن بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی بەش و، لەبەردەم ئەمندار بەرپرسە لەسەر کارەکانی.

ب- لە ڕێگەی ئەمیندارەوە ڕاوێژ پێشکەش بە بەڕێوەبەرایەتی دەکات لەسەر سەرجەم بابەتەکانی پلاندانان.

ت- دابینکردن و گەشە پێدان بە پلانی مەشق و فێرکردن.

پ- نوێکردنەوە و بڵاو کردنەوەی ئامۆژگارییەکان و ڕونکردنەوە لەسەر فەرمانەکانی مەشق.

ج- دابینکردنی نوێترین زانیاری لە میزانیەی ساڵانە.

ح- دیاریکردن و شیکاری بۆ ڕیزبەنکردنی کاتی مەشق و فیچربونن کاتێك مادەیەکی نوێ یان وانەیەکی نوێ زیاد دەکەیت.

خ- چاودێریکردن و سەرپەرشتیکردن سەرجەم کاروبارەکانی پەیوەست بە بیروباوەڕی سەربازی و پێشکەشکردنی ڕاوێژ بە ئەیمندار و دامەزراوەکانی دەورو وپشتی.

د- پلاندانان و بەدواداچوون و سەرپەرشتیکردنی سەرجەم ئامادەسازی و ناردنی کارمەندە نوێکان و پێشکەشکردنی پێشنیار لەسەر گۆڕانکاری و چاکسازی کردەیی لە میلاکاتدا بەپێی ئەو ئەزمونەی هەیانە.

١١- <u>ئەرکەکانی بەڕێوەبەری بەشی پەیوەندییەکان</u>

أ- هەڵدەستێت بە ئاراستەکردن و هەماهەنگی لەسەرجەم کارەکانی پەیوەندیدار بە پەیوەندییەکان و بەرپرسە بەرامبەر ئەمیندار لەسەر هەموو ئەم شتانە.

ب- لە ڕێگەی ئەمیندارەوە ڕاسپاردە و ئامۆگارژییەکان لەسەر هەموو کێشەکانی بەردەم پەیوەندیەیکان و ڕێکخستنیان ئاراستەی بەڕێوەبەرایەتی دەکات.

ت- گەشەپێدان بە پلان و هاوکاری کردنی دامەزراوەکانی پەیوەندیکردن و ڕێکخستنی زانیارییەکان لە فەرمانگەی مەشق.

پ- بەڕێوەبردن و هەماهەنگی و گواستنەوە و گۆڕانکاری زانیارییەکان لەنێوان بەڕێوەبەرایەتییەکان و بەڕێوەبەر.

ج- ئامادەسازی و پێشکەشکردنی زانیارییەکان بەکورتترین شێوە بۆ بەڕێوەبەر و ئەیمندار و هەیئەی ڕوکن، ئەگەر داوایان کرد.

ح- دابینکردنی نوێترین زانیاری بۆ بەشەکانی پەیوەندی لەسەر میزانییەی بەشی پەیوەندییەکان.

١٢- <u>ئەرکەکانی بەڕێوەبەری بەشی مەشق</u>

أ- هەڵدەستێت بە کۆنتڕۆڵکردن و ئاراستەکردن و هەماهەنگی سەرجەم کارەکانی مەشق، وە بەرپرسە بەرامبەر ئەمیندار

ب- پێشکەشکردنی ڕاوێژ بۆ یاریدەر لەڕێگەی ئەمیندارەوە لەسەر بابەتەکانی مەشق/ فێرکردن.

ت- هەماهەنگی و سەرپەرشتی سەرجەم کاروبارەکانی پەیوەندی بە بابەتی مەشق/ فێرکردن.

پ- دیاریکردنی داواکاریەکانی مەشق/ فێرکردن.

ج- بەڕێوەبردن و کارگێڕیدانی پلانی پشکنین بۆ مەبەستی هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوە بۆ مەشق.

ح- پلاندانان و هەماهەنگی لەگەڵ لایەنەکانی پەیوەندیدار بە مەبەستی کردنەوەی خول لە دەرەوەی هەرێم و بەشداری کردنی کارمەندەکانیان لە خولی مەدەنی و سڤیلی تایبەت.

خ- بەڕێوەبردنی هەڵسەنگاندن لە فەرمانگەی مەشق.

د- هەماهەنگی لەگەڵ لایەنی پەیوەندیدار بە مەبەستی ڕاستاندنی بڕوانامەی کارمەندەکان، کە بزانن بڕواپێکراوە یان نا.

ژ- نوسین و بەرزکردنەوەی ڕاپۆرتی بەڕێوەچونی مەشق بۆ لای بەڕێوەبەرایەتی.

١٣- **ئەركەكانی بەڕێوەبەری بەشی ژمێریاری**

**أ- بەرپرسە بەرامبەر سەرجەم گرێبەست و كاروباری دارایی.**

**ب- هەڵدەستێت بە پیادەكردنی سەرجەم ئەو پرۆسانە پەیوەندییان بە داراییەوە هەیە، بەرپرسە لەسەریان لەبەردەم ئەمینداردا.**

**ت- پێشكەشكردنی ڕاوێژ بۆ بەڕێوەبەر لەڕێگەی ئەمیندارەوە دەربارەی بابەتە داراییەكان.**

**پ- كورتكردنەوەی میزانیەی دارایی ساڵانە بۆ مەشق و فێكردن و كۆنترۆڵكردنیان.**

**ج- دیاریكردنی سەرچاوە داواكراوە داراییەكان.**

**ح- بەدەست هێنانی پێشینە داراییەكان و دابەشكردنیان.**

**خ- ڕێكخستنی بڕی تێچووی شتەكان و دانانی پلانی بژاردنیان.**

**د- بەكارهێنانی نوێترین كاڵای دارایی كە بگونجێت لەگەڵ پلانی ساڵانە و ئەو دەوریەی كە ساڵانە هەیانە.**

**ژ- پاڵپشتی لیژنەی كڕین.**

**ر- ئاراستەكردنی سەرجەم چالاكییە گرێبەستەكان.**

**ز- كورتكردنەوەی گرێبەست و مامەڵەكانی كڕین و پاڵپشتی فەرمانگەی مەشق.**

# وەرزی چوارەم

## بەدەستهێنان و مامەڵەکردن لەگەڵ بەرید

١- **گشتی**

بۆ مەبەستی ئاسانکاری بەرید لەناو یەکەکان و سەرکەوتی ئەم پرۆسەیە لەناو لیوایەك پێویستە ئەم خاڵانە بگرینە بە:

أ- وەرگرتنی بەرید لەلایەن فەرمانگەی بەریدی گشتی وەزارەتی بەرگی (پێشمەرگە).

ب- وەرگرتنی بەریدی هاتوو لەلایەن دەسەڵاتی باڵای وەزارەتەکەن یان یەکەکەی سەروخۆت.

ت- بەریدەکان لە تۆماری هاتودا وەردەگرن و پاشان دابەشی دەکەن بەسەر بەشەکاندا، لەژێر چاودێری ئەفسەری ڕوکن.

پ- وەرگرتنی بەرید لەلایەن ئەو بەشانەی کە بەریدی هاتوویان بۆ دێت لە تۆمارەکانیاندا.

ج- ئامادەسازی بەریدەکان لەلایەن بەشەکان دوای ئەوە زانیان پەیوەندی پێیانەوە هەیە و، ئەفسەری روکن و بەڕێوەبەری بەش بینیان.

ح- دیسان گەڕاندنەوەی ئەو بەریدانە بۆ لای ئەمیندار و دواتر بۆ نوسینگەی نامەبەر دواتر بۆ بەشەکان بە مەبەستی گرتنەبەری ڕێوشوێنی تایبەت بەخۆیان.

خ- دابەشکردنی بەریدەکان لەناو و بەشەکان بە پێی پێشینە و لەپێشینەیەیان وەڵام دەدرێنەوە.

د- دواتر بەریدەکان دەگەڕێنرەوە بۆ نوسینگەی و لەوێوە بۆ لای ئەمیندار و بەڕێوەبەر بە مەبەستی پشت ڕاستکردنەوەیان و ئیزار و مۆر دەکرێن.

ژ- دووبارە بەریدەکان دەگەڕێنەوە بۆ نوسینگە بە مەبەستی دوبارە ژمارەی دەرچونیان لێبێت و دواتر دەدرێت بە نامەبەری بڕواپێکراو ئەویش دەیدات بە بنکەکەی خۆی.

١- **دەستاو دەستی بەرید**

أ- **نوسراوی هاتوو**

یەکەم: بەرید لەلایەن سەرۆکایەتی ئەرکان و فەرمانگەکانی دیکە و فەرماندەیی و بەڕێوەبەرایەتی و، وەزارەتەکە سەر بەو دەزگایە دێت بۆ دیوانی وەزارەت و دواتر دیوانی وەزارەت بەم شێوەیە لەگەڵیان مامەڵە دەکات:

١- ئەو نوسراوانەی کە لەسەریان ئاستی نهێنیبوون (نهێنی و تایبەت) هەیە، ئەمە دەبێت دۆسیەی تایبەتی بۆ بکرێتەوە لەلایەن ئەمیندار و ڕاستەوخۆی بەڕێوەبەرایەتی باڵا سەپەرشتی دەکات و سەیری دەکەن.

٢- ئەو نوسراوانەی کە بابەتی (تا ڕادەیەك نهێنی) لەسەرە سەرۆك بەشەکان سەیری دەکەن.

دووەم: بەریدە هاتووەکان دەخرێنە بەردەستی بەشەکانی فەرمانەگە بۆ ئەوەی سەیری بکەن و بەدواداچون بکەن، لە ژێر سەرپەرشتی ئەمینداری گشتی دوای ئەوەی زانیان بۆ ئەوانە ئەوە پێشنیار و بۆچونی خۆیان دەخەنە ڕوو، پێویستە ئاماژە بدرێت بەوەی کە دەبێت ئەفسەرەکان خۆیان سەرپەرشتی بکەن ئیدی ئەمە پەیوەندی بە چی مامەڵەیەکەوە هەیە و دەبێت چۆن وەڵام بدرێتەوە، یان ئایا ئەمە هیچ پێشینەیەکی هەیە لای ئێمە یان نا، پێویستە ئەفسەری روکنی تایبەت داوای بۆچون بکات لە بەرپرسی بەشەکان و ئەویش لەڕێگەی ئەمیندارەوە بیخاتە بەردەست بەڕێوەبەر.

سێیەم: ئەمیندار سەیری ئەو بەریدانە دەکات کە دێنە بەردەستی و ئەویش گرنگترین خاڵەکان دەخاتە بەردەستی بەڕێوەبەر ئەویش ئاماژە دەدات بەوەی کە ڕێوشوێنی تایبەتی بگرنە بەر و دوای وەرگرتنی بۆچونی لەسەر بونی پێشینەی ئەو نوسراوە ئاگادارمان بکەنەوە.

چوارەم: بەشەکانی فەرمانگە دەست دەکەن بە کارکردن لەسەر ئەو بەریدانەی لای ئەمیندار هاتوون لە ژێر ڕۆشنایی ئەو لەسەر نوسراوانەی کە لەسەر حاڵەتی ناوەڕۆکی نوسراوەکە هاتووە، پاشان دەیبەنە بەردەست بەڕێوەبەر.

ب- **بەریدی ڕۆشتوو**

یەکەم: دوای گەڕانەوەی بەریدەکان لای بەڕێز بەڕێوەبەرەوە ئەمیندار هەڵدەستێت بە پشکنینی نوسراوەکان و ئەو تێبینیانەی لەسەر نوسراوەکان هاتوون، بە پێی نوسراوی بەڕێز بەڕێوەبەر

دوباره دەگەڕێتەوە بۆ بەشەکان و بەپێی پسپۆڕی خۆیان ئەوانیش هەڵدەست بە وەڵام دانەوەی ئەو نوسراوە.

دووەم: بۆ بەدەست هێنانی کات و گەڕاندنەوەی توانا بەرپرسی بەشەکانی فەرمانگە هەڵدەستن بە دارشتنەوەی رەشنوسی نوسراوەکان و پەیامە گرنگەکان، بەڵام بۆ ئەو بەریدانەی کە هەموو رۆژێك دەکرێن پێویست بە رەش نوس ناکات، چونکە دووبارەن و رۆژانە دوبارە دەبنەوە.

سێیەم: دواتر بەریدەکە هەمان زنجیرەی پێشوو دەگرێتەوە سەرەتا لە بەڕێوەبەری بەشەکان بۆ ئەمیندار و لەکۆتایدا بە ئیمزای بەڕێوەبەر کۆتایی دێت.

چوارەم: ئەوەی تایبەتە بە بەریدی رۆشتوو و ئەفسەری روکن سەرپەرشتی دەکات ئەویش بەپێی ئەو کە لەسەری نوسراوە و پەراوێزی داناوە بەم شێوەیە دەبێت:

١- لەو مامەڵانەی کە لەلایەن بەڕێز فەرمانداەوە پەراوێزی لەسەر نوسیوە و هامشی کردووە لە بەشی رأستی خوارەوەی نوسراوەکە، بەڵام بەڕێوەبەری بەش لە ژێر کۆمەڵەی ئیمزاکان لەسەری دەنوسێت.

٢- پێویستە سەرجەم ئەفسەرانی فەرمانگە رەچاوی فەرمانەکانیان بکەن، بەتایبەت ئەو فەرمانانەی کە بۆیان دێت و نابێت پشتگوێی بخەن و شێوەیەکی ناشرین پێشکەش بکەن.

**٣- بەرپرسیارێتی و گفتوگۆکردن لەسەر ئەو بەریدانەی هاتون و ئیمزاکراون**

**أ- بەرپرسیارێتی گشتی دەکەوێتە سەرشانی ئەمینداری فەرمانگە و هەیئەی ڕوکن پێویستە کارەکانیان لە میانەی ئەو یاسایەی کە کاری لەسەر دەکەن، بەپێی لە پێشینەیی کار دەکەن.**

**یەکەم: بابەتی فەرماندیە: پسپۆڕی بیرکاری بەڕێوەبەرە، یان هەر کەسێك لە جێگەی دادەنیشێت.**

**دووەم: بابەتەکانی واجباتی ئەرکان. ئەو و بابەتانەن کە لە پسپۆڕی و هەیئەی ڕوکنی فەرمانگەکەیە و، ئاراستەی بەڕێوەبەر دەکرێت.**

**بنەمای کارکان لەلایەن بەڕێوەبەرەوە دەردەچێت دواتر بوار دەدات کە بەم شێوەیە پلانەکەیان دابڕژنەوە، ئەویش بەم شێوەیە:**

**یەکەم: بڕیارەکان لە لایەن بەڕێز بەڕێوەبەرەوە دەردەچێت.**

**دووەم: وردەکاری و بەدواداچوون لەلایەن دەستەی ڕوکن و سەرجەم ئاستەکانی دیکەیە.**

**ب- لەسەر ئەو بنەمانەی سەرەوە ئیمزاکان بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت:**

**یەکەم: ئەو بابەتانەی کە پێویستی بە وەرگرتنی بڕیارە بۆ ئیمزاکردنی دوار وەگرتنی بڕیاری بەڕێوەبەر یان ئەو کەسەی کە سەرپشکی کردووە لە ئیمزاکردن.**

**دووەم: ئەو بابەتە ئاساییانەی کە پێویست بەوەرگرتنی بڕیار نییە و لەلایەن ئەمیندارەوە ئیمزادەکرێت دوای ئەوەی لایەنی پەیوەندیدار سەیریکردووە.**

**ت- ئیمزای مامەڵە و نوسراوی فەرمی بەم شێوەیەیە:**

**یەکەم: ئەو مامەڵانەی لەلایەن بریکارەوە ئیمزا دەکرێت. ئەویش ئەو مامەڵانەن کە پەیوەندییان بە دەسەڵات و بەرپرسیارێتی ئەوەوە هەیە جگە لەخۆی هیچ کەس ناتوانێت ئیمزای بکات، ئەوانیش:**

**١- ئیمزاکردن لەسەر ڕاسپاردە (الوصایا) و ئاراستەکردن و پلانەدانان.**

**٢- ئیمزاکردن لەسەر ڕاپۆرتی هەڵسەنگاندنی یەکە و هەیئەی ڕوکن.**

**٣- ئیمزا لەسەر کۆنگرە و سیمینار و وتار و ئەو ڕێکەوتنانەتی لە ناو هێزە جۆراو جۆرەکان ئەنجام دەدرێت.**

**٤- ڕاستاندن و پشت ڕاستکردنەوەی بابەتی پلەبەرزکردنەوە و ڕێزلێنان و گواستنەوە و پاداشت و سزا.**

**٥- بابەتە یاسییەکانی وەك فەرمانی ڕەوانەکردن بۆ دادگا و ڕاستاندنی (التصدیق)ی حوکمەکان.**

٦- هەر کاروباریکی دیکەی پەیوەندیدار بە پلەی بەڕێز بەڕێوەبەر کە سەرپشت نەکرابێت بە دەست تێوەردان.

دووەم: ئەو مامەڵانەی لەلایەن بەڕێوەبەرەوە یان ئەمیندارەوە ئیمزای لەسەر دەکرێت، لەکاتی نەبونی بەڕێوەبەردا.

١- وەڵام دانەوەی سەروخۆت.

٢- ئەو توێژینەوانەی کە بەرزکراونەتەوە و پێویست بە دەربڕینی بۆچون و پێشنیاری بەڕێوەبەرە.

٣- ئەو بابەتانەی کە پەیوەندیان بە ئاسایشی سەربازییەوە هەیە کە پێویست بە بەدواداچونی دەرەوەی یەکەکە لەبواری مەدەنیدا هەیە.

٤- سەرجەم فەرمانەکان کە بۆ بەڕێوەبەرایەتی و ئەو فەوجانە دەڕوات لە ژێر سەرپەرشتی ئەو لیوادایە.

٥- کاندین کردنی ئەو خولانەی لەدەرەوە هەیە.

سێیەم: ئەو مامەڵانەی کە بەڕێوەبەر ئەمینداری سەرپشك کردووە بە ئیمزاکردنیان.

١- دیاریکردن ئەندام لە لیژنەکانی فەرمانگەکە و بە ڕەزامەندی سەروخۆی.

٢- سەرجەم ئەو فەرمانانەی کە دەدرێت بە فەرمانگەکە.

٣- لاری نەبون و ڕێگەدان بە دەرچونی هەر ئەفسەرێك لەناو بارەگای لیوا بە هەر بیانوییەك بێت.

٤- پێدانی مۆڵەتی کاتی و خولانەوە ئەفسەرەکان لەناو فەرمانگەکەدا.

٥- سەرجەم ئەو فەرمانانەی دوای کۆنگرەکە لەسەرو خۆیەوە ئاماژەی پێدراوە بەئەنجام دانی.

٦- تۆماری ڕۆژانە و ئامادەبونی فەرمانبەرانی فەرمانگەکە.

چوارەم: ئەو بەریدە ڕۆشتوانەی گشتاندن/ بە مەبەستی ئیمزاکردن بە ئەمیندار دەوترێت دوای نوسینی تێبینی لەلایەن بەڕێوەبەرەوە و نوسین لەسەر نوسراوە سەرەکییەکە ئەمیندار ڕەزامەندی لەسەر دەدات.

**كاتى دەستاو دەستكردنى بەريدەكان**

أ- دەستاو دەستكردن و سوڕانەوەى بەريد بەبێ بونى كاتى دەرچونى نوسراوەكە كاتى زۆر بە هەدەر دەداتن ئەفسەرى ڕوكنيش بەتەواوى تواناى ئەوەى نييە كە نوسراوەكان ڕيز بكات و كاتيان بۆ دايارى بكات، بۆيە پێويستە

يەكەم: بەريدى ئاسايى بۆ بەڕێوەبەرى بەشەكان لە كاتژمێر (٠٩٠٠) دەست پێبكات بۆ ئامادەسازى.

دووەم: بەلاّم ئەو بەريدانەى كە زۆر پێويست و گرنگن پێويست بەوە نييە كە كاتى لەسەر دابنێين، چونكە هەميشە ئامادەى وەلاّمدانەوەن.

ب- ئەفسەرى ڕوكن هەڵدەستێت بە پۆلێنكردنى بەريدەكان لە حاڵەتى ئاسايى و خێراكان، بۆيە پارچە كاغەزى سور دەلكێنێت بە لاى ڕاستى بەشى سەرەوەى نوسراوەكان، كە ئەمە واتا بەخێرايى و لە پێشترە بۆ وەلاّمدانەوە و بەدواداچون بەخێراترين كات.

ت- لەكاتى نەبون يان نەهاتنى ئەفسەرى ڕوكن ئەو ئەفسەرەى كە ڕاى دەسپێرێت ئەو مامەڵە ئاساييەكان ئيمزا دەكاتن بە مەرجێك لە خوارەوەى ناوى بەڕێوەبەر لە كۆمەڵەى ئيمزادا ناوى خۆى بنوسێت.

### ٦- جوڵانەوە لەگەڵ مامەڵە گرنگەکان

**هەندێك مامەڵەی گرنگ هەیە کە پێویستە بەشێوەیەکی دروست چارەسەری بکەیت، ئەویش:**

**أ- ڕودانی کارەسات و زیان کەوتن و کاری تیرۆریستی و ڕوداوە بەپەلەکان کە پێویستیان بەچارەسەری خێرا و ڕێگە چارەی مەیدانی هەیە**

**ب- ئەو مامەڵانەی کە کاتی دیاریکراوی هەیە و پێویستە بەباشترین و تەواوترین شێوە مامەڵەی لەگەڵ بکەیت، وەك خولی دەرەوەی وڵات و کۆنگرە لەپڕەکان.**

## وەرزی پێنجەم
## یاسای کارکردن لە نوسینگەدا

١- **بەرپرسی نوسینگە**

أ- بەرپرسە لە ڕێکخستن و بەڕێوەبدرن و یەکخستنی ئاسایشی نوسینگەو بارەگای لیوا. کارەکانی بەوردی و پوختی و خێرایی پیادەدەکات مەرجەعی یەکەمی تەواوی کارمەندەکانە.

ب- پابەندی سەرجەم ئەو فەرمانانە دەبێت کە لە لالەنی بارەگای فەرمانگەوە دەردەچێت و بەوردی پیادەی دەکات و بەدواداچون بۆ هەموو بەشەکانی نوسینگە دەکات.

ت- وردەکاری لە بەردیدە هاتووەکان دەکات کە لە تۆماری هاتوودا تۆمار کراوە.

پ- بەریدە ئاساییەکان دەکاتەوە و دابەشیان دەکات بەسەر ئەو بەشانەی کە سەر بەئەون.

ج- بەریدە تایبەتەکان وەردەگرێت و لەکاتی دیاریکراودا دەیخاتە بەردەم ئەمیندار.

٢- **نوسەری بەریدی هاتوو**

أ- بەریدەکان وەردەگرێت دڵنیادەبێت کە بەرپرسی یەکەمی خۆی بینیویەتی.

ب- لەژێر تیشکی ئەوەی کە ئاماژەی پێدراوە بەریدەکان لە تۆماری تایبەتدا تۆمار دەکات.

ت- بەریدی هەموو بەشەکان دەداتە دەستی خۆیان، دوای ئیمزای بەرپرسی نوسینگە.

پ- نوسراوێك لە هەموو ئەو نوسراوانە کە هاتووە لە دۆسیەی تایبەت هەڵدەگرێت.

٣- **نوسەری بەریدی ڕۆشتوو**

أ- دوای دڵنیابوون لە هەموو ڕێو شوێنەکانی نوسینەکە ڕەوانەی دەرەوەی دەکات.

ب- بەریدەکان لەسەرو خۆی وەردەگرێت و دوای دڵنیابون لە تۆماری تایبەتی ڕۆشتوودا ناو و پلەی ئەو کەسە دەنوسێت کە بەریدەکەی ڕادەست دەکات بۆ دەرەوەی لیوا.

ج- نوسخەیەکی تایبەت لە نوسراوی ڕۆشتووە دەخاتە دۆسیەی تایبەت و بەرپرسە بەرامبەری.

پ- جەخت دەکاتەوە لە پاکی تۆماری ڕۆشتو.

٤- **<u>بڕوا پێکراوی بەڕێوەبەرایەتی</u>**

أ- **بەریدی هاتو و ڕۆشتو دەبات.**

ب- **لەکاتی دەوامی فەرمیدا بە ڕاسپاردەی بەرپرسی نوسینگە نوسینکەکان ئاراستەی لایەنی پەیوەندی دار دەکات.**

٥- **<u>ئەرکەکانی بەشەکانی نوسینگە</u>**

أ- **ئەرکەکانی بەرپرسی نوسینگە**

**یەکەم: بەرپرسە بەرامبەر بەرپرسی بەش لەسەر هەموو ئەو شتانەی پەیوەندیان بە نوسینگەوە هەیە و، ئەرکەکانی بەباشی تێدەپەڕێن و مامەڵەکان بەباشی بەڕێوەدەبات و، کەمتەرخەمی ناکات لەکارەکانیدا.**

**دووەم: دڵنیایە کە سەرجەم نوسراوی ڕۆشتوو هاتو و دراوە بەدەستی بەرپرسی بەشەوە.**

**سێیەم: وەرگرتنی بەریدی هاتوو لە بەرپرسی بەشەکانە و دڵنیابون لە گەیاندنی تەواوی بەریدەکان بۆ بەرێوەبەری بەش و چاوپێداخشاندنەوە و ئیمزاکردنی لەلایەن ئەمیندارەوە.**

**چوارەم: پیادەکردنی ڕاسپاردەکانی ئەمیندار چارەسەرکردنی کێشەکانی نوسینگەی لە ئەستۆی ئەم دەبێت.**

**پێنجەم: دەرنەکردنی هیچ دۆسیە لە نوسینگەی بەش بۆ هیچ لایەك بەبێ ڕەزامەندی بەرپرسی نوسینگە.**

**شەشەم: پارێزگاری لە کەرەستە و پێداویستییەکانی ناو نوسینگەی بکات کە کاریان لەسەر دەکات و، بەبەردەوام گرنگیان پێبدات.**

ب- **کارمەندی نوسینگە لەناو بەشدا ئەم کارانەیان لە ئەستۆدایە:**

**یەکەم: دەرکردنی پێشینە و تۆمارە سەرەکییەکان و دوای کارەکەی گەڕاندنەوەی بۆ ناو دۆسیەکەی خۆی.**

**دووەم: سەرپەرشتی چاپکردن و کۆپی کردن و دابەشکردن و هێمادارکردنیان دەکات.**

**سێیەم: وەرگرتنی نوسراو و نامەکان لە سندوقی هاتووی فەرمانگە و دانانی نوسراوە ڕۆشتووەکان.**

**چوارەم: پاراستنی مامەڵەکان لە ناو دۆسیەی تایبەت بەخۆی.**

پێنجەم: پێچانەوەی نوسراوە پێویستەکان بەوردی و ژماردنی پەڕەکان.

٦- **ئەرکەکانی ئێشکگری نوسینگە**

أ- نوسەری ئێشکگر لە فەرمانگەدا بەرپرسە لەبەردەم ئەمینداردا لە بەڕێوەبردنی نوسینگە و ڕێکخستن و پاراستنی ئاسایشی نوسینگە و کارەکانی.

ب- بەریدە ئاساییەکان دەبینێت و لە تۆماری هاتودا تۆماریان دەکات، پاشان ئامادەیان دەکات بۆ ئەمیندار، بەڵام نوسینە نهێنییەکان ئەوانەی پلەی نهێنیان دیاریکراوە دەستکاری ناکات، ئەوانە تەنها لەلایەن بەڕێوەبەرەوە دەکرێنەوە.

٧- **کارەکان لە نوسینگە**

أ- بەڕێوەبەری یەکەم بەرپرسە لەبەردەم ئەمینداردا بەرامبەر کارگێڕیدانی نوسینگەکەی و ڕێکخستن و پاراستنی زانیاری و نهێنییەکانی ناو نوسینگە.

ب- نوسینە ئاساییەکان دەکاتەوە و لە تیانوس (السجل)ی تایبەتیدا تۆماریان دەکات، دوای پێچانەوە و سەیرکردنی پێشینەکانی پاشان دەیخاتە بەردەم ئەمیندار، بەڵام ئەگەر بەریدێك پلەی نهێنی لەسەر بوو، ئەوە تەنها لەلایەن ئەمیندارەوە دەکرێتەوە.

ح- هەڵدەستێت بەوەرگرتنی بەریدەکان و دوای ئەوەی پەراوێزی لەسەر نوسی دابەشی دەکات هەرکەس و بەشی تایبەت بەشەکەی خۆی دەبات.

خ- بە ڕیزبەندی و یەك لەدوای یەك ژمارە بۆ هەموو نوسینە ڕۆشتوەکانی فەرمانگە دادەنێت.

٨- **کاکردن لە بەشەکانی نوسینگە**

أ- دوای ئەوەی بەریدەکان دەگەنە نوسینگە سەیر دەکرێت بزانێت تایبەت بەوانە یان پەیوەندی پێیانەوە نییە و، ئەگەر لە پێشینەیی و کاری بەپەلەیان تیابوو ڕیزی دەکات.

ب- دوای ئەوەی بەریدەکەی وەرگرت و کاری لەسەرکرد هەر یەکە و بەشی خۆی دەبات بۆ وەڵام دانەوە.

ح- ئەگەر بەریدەکان داوای بەدواداچونی دەکرد لەسەر شتێك دوای بەدواداچونی ورد بە پێی ئەو یاسایەی هەیانە وەڵامی دەدەنەوە.

خ- بەرپرسی نوسینگە وەڵامێکی شێوەیی دەنوسێت و پاشان دەیخاتە بەردەستی ئەمیندار بزانێت تێبینی لەسەری چییە.

د- دوای چاپ کردنی نوسینەکە لەلایەن بەرپرسی بەشەوە وردەکار و هەڵەگری بۆ نوسینەکە دەکات.

ژ- دوای ئیمزاکردنی نوسراوەکە لەلایەن بەڕێوەبەردەوە دیسان دەێردرێتەوە بۆ بەشەکەی خۆی.

٩- <u>ئیمزاکردنی بەردەکان</u>

أ- سەرجەم بەریدەکان لەلایەن بەڕێوەبەرەوە ئیمزا دەکرێت، جا ئاراستەی سەرەوە بکرێت یان ئاراستەی خوارەوەی خۆیانی بکات.

ب- بەریدی ناوخۆیی لەلایەن ئەمیندارەوە ئیمزا دەکرێت.

پ- پێویستە لەکاتی خستنەڕووی بەریددا ئەم خاڵانە ئەنجام بدەیت:

ج- یەکەم: دانانی پەڕەکانی بەرید لە ناو دۆسیەیەکدا بە پێی گەورەی و بچوکیان، سەرەتا وەرەقەی

بچوك پاشان پێچانەوەی پەڕەکان دواتی دۆسیەکان لەکۆتاییدا دابنێیت.

دووەم: بەستنەوەی پێشینەی لەسەر ئەو نوسراوە ئەگەر هەبوو پاشان بخرێتە ڕوو.

سێیەم: ئەگەر پەڕەی بچوك هەبوو ئەوە لە بەیەکیانەوە دەیان چەسپێنین و و پاشان لەگەڵ بەریدەکانی دیکە دایان دەنێین.

چوارەم: ئەگەر پێویستی کرد پەڕەی بچوك بلکێنرێن بە نوسارووەکانەوە.

پێنجەم: ئەگەر هەبوو، بەریدە نهێنی و تایبەتەکان بەدەستی بدرێتە دەستی ئەفسەرەکان.

شەشەم: ئەو نوسراوانەی کە بەپەلەن پێویستە بە دەستی کارەکانیان ڕاپەڕێنیت.

١٠- <u>مامەڵە هاوبەشەکان</u>

أ- ئەگەر بەریدێك هەبوو ئاراستەی چەند بەشێکی یەك فەرمانگە کرابوو، ئەوە پێویستە کۆپی بکرێت و دوای ئیستنساخ کردنیان بنێردرێت بۆ لایەنەکەی دیکە کە پەیوەندی پێیەوە هەیە.

ب- دوایی هەڵدەستێت بە دابەشکردنی پسپۆڕییەکان بەسەر ئەو شوێنانەی کە پێویست و داواکراوە پاشا وەرگرتنی هەموو وەڵامەکان، یەکیان دەخات پوختەی ئەم وەڵامە

کۆدەکاتەوە و دەینێرێتەوە بۆ بەشەکان بۆ وردەکاری لەسەر ئەو زانیاریانە و هەر بەرپرسی بەشەو هامشی خۆی دەکات و وەڵامی دروست وەردەگرێت.

ح- پاش چاپکردن و وردەکاری و هامش لەسەر نوسین لەلایەن بەرپرسی بەشەوە و دوای ئیمزاکردن لەلایەن بەڕێوەبەرەوە یان لەلایەن ئەمیندارەوە لە دۆسیەی تایبە بەخۆی دەی پارێزین.

١١- مامەڵە بەردەستییەکان

أ- لە هەموو بەشێکدا پێویستە دۆسیەیەك یان تیانوسێك هەبێت بە ناوی (بەردەست)، ئەو نوسراوانەی تیا تۆمار بکرێت کە جارێ جێبەجێ نەکراون.

ب- دوای دڵنیابون لەوەی کە ئەو مامەڵانە هێشتا جێبەجێ نەکراوە پێویستە لە ماوەی (١٥) ڕۆژدا بەدواداچونی بۆ بکەین، بەلایەنی کەمەوە (٧) حەوت ڕۆژ لە هاتنی ئەو نوسراوە پێویستە وەڵامەکە بگات.

خ- دوای وەرگرتنی وەڵامەکە مامەڵەکە لە ناو دۆسیەی تایبەتیدا دەپارێزێن.

١٢- دەستاودەستکردنی نوسراو دوای دەوامی فەرمی

لە ڕۆژانی پشوودا کارمەندی نوسینگەی ئێشکگر بەریدەکان وەردەگرێت و، سەیری بەریدە ئاساییەکان دەکات و پاشان نوسینە بەپەلەکان پیشانی ئەفسەری ئێشکگر دەدات، بەڵام ئەو نوسراوەی پلەی نهێنی بونەکەی تیا نوسراوە بەهیچ شێوەیەك دەستکاری ناکات و دەیداتە ئەفسەری ئێشکگر، پێویستە ڕێوشوێنی بەپەلە بگیرێتەبەر بەرامبەر ئەو نوسراوانەی کە پێویستە بە پەلە و بێدواکەوتن وەڵام بدرێنەوە.

١٣- پلەی نهێنی و لەپێشینەیی

أ- تێبینی پلەی نهێنی و لە پێشینەییەکانی نوسراوەکان دیاری دەکان، پلەی نهێنییەکان بەم شێوەیەیە:

- ئاسایی (أعتیادی)
- سنوردار (محدود)
- نهێنی (سری)
- زۆر نهێنی (سری للغایە)
- نهێنی و تایبەت (سری وشخصی)

ب- پلەی نهێنی و لە پێشینەیی لەلایەن ئەو ئەفسەرەوە دیاری دەکرێت کەنوسراوەکە دەنوسێت.

ت- له پێشینەیی (بەپەلە) پێویستە لە ماوەی یەك حەفتەدا جێبەجێ بکرێت و وەڵام بدرێتەوە، بەڵام نوسینی ئاسایی ئەگەر زیاتر لە حەفتەیەکیش بخایەنێت کێشەیەکی ئەوتۆ دروستناکات.

**١٤- هەڵسەنگاندنی دۆسیەکان**

أ- هەموو ئەو نوسراو و نامانەی کە هاتوون بە (ا-ب-ج) ڕیزبەندی دەکرێن و لە بەشی چەپی لای خوارەوە هەموویان دیاری دەکەین.

ب- ئەو ئەفسەرەی ئەم ڕیزبەندییە ڕێك دەخات لەناو نوسراو و پەیامەکاندا ئاماژە ڕاست () دەدات لەوەی کە پێویستە.

ت- پێکهێنانی لیژنەیەکی سەرەکی و لیژنەیەکی لاوەکی بۆ جیاکردنەوە و پۆلێنکردنی بەڵگەنامەکان و هەرکەس ئەرکی خۆی پێ بسپێردرێت.

**١٥- پاراستن و خستنە ناو دۆسیەکان**

پ- ڕۆژانە سەرجەم مامەڵە و نوسینەکان لە دۆسیەی تایبەت بەخۆی هەڵبگیرێت و، نابێت دوا بخرێت بۆ ڕۆژی دواتر.

ج- نوسینگەی پۆست و نوسینگەی بەشەکان هەڵدەستن بە ژمارەلێدان لە دۆسیەکان و هەر دۆسیە و کلیلی خۆی لەسەر بێت بۆ ئەوەی چی لەو دۆسیەدا هەیە تۆمار بکرێت.

**یاسای پێشکەشکردنی بەریدی ڕۆژانە و ئیمزازردنی لەلایەن لیواوە**



## وەرزی شەشەم

## کاروباری کارگێڕی

1- **کارمەندە نوێکان**

کاتێك کارمەندی نوێ (ئەفسەر -سەربازی- سڤیل(مدینی)) ڕودەکەنە فەرمانگەی کەت، پێویستە ئەم ڕێو شوێنانە بگریتەبەر:

أ- نوسراوی گواستنەوەی بخەیتە بەردەست ئەمیندار و ئەویش بیخاتە بەرچاوی بەڕێوەبەر.

ب- لە لایەن بەشی کارگێڕی و ڕاگەیاندن لە تۆماری فەرمانەکانی بەشی دوودا ناویان بنوسیت.

ت- لەلایەن بەڕێوەبەرەوە شوێنەکەی بۆ دیاری دەکرێت.

پ- ئەگەر ئەفسەربوو دەخرێتە بەشی ئومەرەوە و دواتر لەلایەن ئەمیندار یان بەڕێوەبەر شوێنەکەی بۆ دیاری دەکرێت.

2- **مۆڵەتەکان**

أ- یاسای مۆڵەتی کارپێکراو لەناو وەزارەتی پێشمەگە و سەرۆکایەتی ئەرکان جێبەجێ دەکرێت.

ب- بۆ ناو شارەکان یەك ڕۆژە لە مانگێکدا بۆ ئەوەی چێژ لە پشووەکان وەربگرن.

ج- مۆڵەتی خولاوە بۆ هەر پارێزگایەکی دیکە (٧) ڕۆژە لە هەموو (٢١) ڕۆژێکدا، دابەزینیش دوای دەوامی فەرمییی ڕۆژی پێنج شەممەیە و، پەیوەندی کردنیش ئێوارەی ڕۆژی هەینییە.

د- مۆڵەتی بەڕێوەبەرەکانی ناو بەڕێوەبەرایەتی بە دەستی بەڕێوەبەر و بەهەماهەنگی ئەمیندارە.

ژ- لەکاتی مۆڵەتی بەڕێوەبەری بەشەکان باڵاترین ئەفسەر یان بریکاری بەڕێوەبەر کارەکانی ڕادەپەڕێنێت.

ر- یاسای جێگرەوە بەکاردەهێنین لەکاتی نەهاتنی هەر بەڕێوەبەرێکی بەش.

3- **مۆڵەتی نەخۆشی**

أ- لەلایەن ئەمیندارەوە سەردانی نەخۆشخانە ئیمزادەکرێت.

ب- نامە و پەیامەکان لەلایەن بەڕێوەبەر یان ئەمیندار ئەنجام دەدرێت ئەگەر بەڕێوەبەر لەوێ نەبوو.

٤- <u>فەرمانە ڕۆژانەکان</u>

مەبەست لە فەرمانە ئاساییەکانی ڕۆژانە بریتییە لە ڕێکخستن و بەرنامەڕێژی کاری ڕۆژانەی بەشێکە لە فەرمانە جێگیرەکان، کارلەسەر ئەوەدەکات کە پێویستە ڕۆژانە ئەو بەرنامەیە بە شێوەیەکی دروستی خۆی بەڕێوە بچێت و، کات و کۆشیی کارمەندەکان بە ئابوریانە بەسەر بەریت، ئەوانیش ئەمانەن:

أ- فەرمانەکانی بەشی یەك:

یەکەم: بەر لە تەواو بونی ئەرکی فەرمی بە کاتێکی پێویست و گونجاو پێویستە دەربکرێت بۆ ئەوەی سەرجەم ئەفسەرەکان بەر لە بەجێ هێشتنی فەرمانگە بیبینن، ئەمەش لەلایەن ئەمیندارەوە دادەڕێژرێت، ئاماژەیە بە دیاریکردنی ئەرکی ئەو ڕۆژە و ڕۆژی دواتر، بۆ ئەوەی لە ئایندەشدا بگەڕێیتەوە سەری، ئەوانیش ئەمانەن:

١- ئەرکەکان.
٢- بەڕێوەبردن (الإدارە)
٣- ڕێکخستن و ئامادەسازی.
٤- نەهاتوو (الغیاب).

دووەم: دابەشکردنی کۆپییەك لە دەرکردنی فەرمانەکان بۆ ئەفسەری کارگێڕی و تابلۆی ڕاگەیاندن (لوحە الإعلانات).

ب- فەرمانەکانی بەشی دوو:

یەکەم: ڕۆژانە لەلایەن بەڕێوەبەرەوە دەردەکرێت و ئەمیندار یان ئەفسەری کارگێڕی ئیمزای دەکات.

دووەم: مەبەست لێی جێگیرکردنی سەرجەم ئەو گۆڕانکاریانەیە کە لە فەرمانگەکە ڕویانداوە، بۆ ئەوەی تەواوی مامەڵە پەیوەندیدارەکانی بۆ بگیرێتەبەر.

سێیەم: فەرمانەکانی بەشی دوو ئەم بڕگانە دەگرێتەوە:

١- دابینکردنی ژمارەکان.
٢- پلەبەرزکردنەوە.
٣- دامەزراندن.
٤- گواستنەوە.
٥- مۆڵەت.
٦- نەخۆشخانە.
٧- نەهاتوو و هەڵهاتن.

٨- سزاكان.

٩- دەركردن و دورخستنەوە.

١٠- سەرپێچی و پێبژاردن.

١١- خەرجییە تەقەمەنی.

١٢- ئامادە.

٥- **بەرپرسیاری بڵاو کردنەوەی فەرمانەکانی بەشی دوو**

أ- **جێگر**

یەکەم: پلەبەرزکردنەوە وەستاندنی پلە.

دووەم: گواستنەوە.

سێیەم: سزادان.

چوارەم: دەرکردن و دورخستنەوە لە سوپاس و خانەنیشن و کۆتایی هاتنی خزمەت.

ب- ئەفسەری کارگێڕی

یەکەم: پێبژاردن و گرەنتی وەگرتن و سەرپێچی.

دووەم: ڕۆشتنە نەخۆشخانە و دەرکردن لە نەخۆشخانە.

سێیەم: دڵنیابونەوە لە دروستی خواردنەکان و بژێوی کارمەندەکان.

٦- **گرنگی پێدانی گشتی**

أ- ئەمیندار هەڵدەستێت بە ئاراستەکردنی رەئیس عورەفای یەکە و بەشەکان بە مەبەستی بەردەوامی دان و بەدواداچونی ڕۆژانە.

ب- پێویستە لەسەر هەموان پارێزگاری و گرنگی بە کەرەستەکانی بەشەکان بدەن.

ح- بەکارهێنانی سەتڵی خاشاکی بچوکی نوسینگەکان.

خ- بەکارهێنانی پاککەرەوە و پزیشکی و تەندروستەکان بۆ هەموو جێگەیەك.

د- دابینکردن و دامەزراندنی هەندێك کارمەندی گونجاو بۆ خزمەتکردن بە مەبەستی گرتنەبەری بەردەوامیدان بە پاك و خاوێنی ڕۆژانە.

٧- **ئەرکەکانی ئەفسەری ئێشکگر**

أ- دوای دەوامی فەرمی بەرپرسە لە کاروباری فەرمانگەکە.

ب- دوای دەوامی فەرمی سەرجەم نوسراو و پەیوەندییەك دەڕواتە لای ئەو.

پ- سەرجەم ئەو ڕووداوانە تۆمار دەکات کە ڕوویان داوە.

ج- شوێنی پاسەوانی دەپشکنێت و دڵنیادەبێتەوە لێیان.

ح- پشکنین و سەرپەرشتی پاکوخاوێنی بارەگای فەرمانگە دەکات.

خ- بە شێوەی یاسایی ئێشکگری ڕادەستی ئەفسەری دوای خۆی دەکات.

## یاسا جێگرەوەکان (نظام البدیلین)

| ژ | بەش | جێگرەوە |
|---|---|---|
| ١ | بەڕێوەبەر | ئەمیندار |
| ٢ | ئەمیندار | لەپێشترین بەڕێوەبەری بەش |
| ٣ | بەڕێوەبەری بەشی کارگێڕی | لە پێشترین ئەفسەری کارگێڕی |
| ٤ | بەڕێوەبەری بەشی هەواڵگری و جوڵان | لە پێشترین ئەفسەری بەش |
| ٥ | بەڕێوەبەری بەشی میرە | لە پێشترین ئەفسەری بەش |
| ٦ | بەڕێوەبەری بەشی پلاندانان | لە پێشترین ئەفسەری بەش |
| ٧ | بەڕێوەبەری بەشی پەیوەندییەکان | لە پێشترین ئەفسەری بەش |
| ٨ | بەڕێوەبەری بەشی مەشق | لە پێشترین ئەفسەری بەش |
| ٩ | بەڕێوەبەری بەشی ژمێریاری | لە پێشترین ئەفسەری بەش |

٨- دەرخستە و ڕاپۆرت

أ- پێویستە لەسەر هەیئەی ڕوکن زیاد لەتوانای خۆیان بارگرانی زۆر نەخاتە سەر بەردەستەکانیان و زیاد لە پێویست فەرمانیان پێنەکات، پێویستە تێبینی ئەم خاڵانە بکات:

**یەکەم: ئایا ئەو زانیاریانە بەردەستن لە بەڕێوەبەرایەتییەکانی دیکە یان تەنها لەم بارەگا هەیە.**

**دووەم: ئایا ئەو دەرخستانە لە یەك بارەگاوە هاتووە یان لە دوو بارەگاوە.**

**سێیەم: دەرخستنەکان سودی نییە ئەگەر ئەگەر سەریی لیستی دەرخستەکان نەکەن، بۆ ئەوەی دڵنیابیتەوە لەوەی چاو پێداخشانەوەکان سودی هەبووە.**

**ب- ئەگەر بەردەوام دەرسختە و پشکنین بکەین و ڕاپۆرت بەرز بکەیتەوە سەرو خۆت هەست بە ناچاکردن و تەنگژەیی دەکات لەکاتێکدا خۆتان دەتوانن لە ناو بارەگاکانی خۆتان دەرخستەکە ئەنجام بدەن و ڕاپۆرت بەرز نەکەنەوە.**

**ت- پێویستە دەستەی ڕوکن لەکاتی خۆیدا دەرخستەکە بەرز بکەنەوە.**

## وەرزی حەوتەم

## پوختەو و کۆنگرە

١- **گشتی**

أ- مەبەست لە پوختە و کورتبڕی بریتییە لە تۆمارکردنی نوسینەکان بەکوتترین شێوە بەجۆرێك هەرکەس بیخوێنێتەوە بەباشی لە تێبینییەکان بگات، ئەفسەری ڕوکن کاردەکات بە کورتکردنەوەی کۆنگرەکان و تۆمارکردنی خاڵە سەرەکیی و پێشنراەکان، بۆ ئەوەی بەباشی کار بکەن.

ب- پێویستە لەکاتی پوختەکردندا ئەم خاڵانە لەبەرچاو بگرین:

یەکەم: هەتا دەتوانین با کورتبێت.

دووەم: وردبێت.

سێیەم: دیارترین خاڵە جەوهەرییەکان چین.

چوارەم: نێوەنگیر و بێلایەنانەبێت.

پێنجەم: پێویستە بڕوای بە ڕەخنەی دروستکەرهەبێت و، پێشناری چارەسەرە جۆراو جۆرەکان بێت.

شەشەم: پێشکەشکردنی ڕاوێژی ئەرێنی بۆ چارەسەری کێشە سەرەکییەکان.

حەوتەم: پێویستە باسی ئەو لایەنانە بکرێت تایبەتن بەو کێشەیە.

٢- **جۆرەکانی پوختەکردن**

أ- پوختەکردنی لە زانیاریدا

کورکرتنەوەکە لەلایەن ئەفسەری باڵا (بەڕێوەبەر- ئەمیندار) پلانی کۆبونەوەکە یان هەر پلانێکی دیاریکراو کورت دەکاتەوە، زانیاری پێویست کۆدەکاتەوە، لەسەر کەسێکی دیاریکراو یاخود کورتی توێژینەوەیەك یاخود هەر سەردانێك کە دەیەوێت ئەنجامی بدات.

ب- پوختەکردن لە بڕیار

پوختەکردن لە بڕیاردا لەسەر بابەتێك یان کەسێك کە پێویستە بزانرێت، بابەتەکان کورت دەکاتەوە لەسەری و چارەسەری زۆربەی زۆری کێشەکان و، کورتبڕی لە کارە لە پێشینەییەکان.

ح- کورتی کۆبونەوە و کۆنگرە

لەکاتی ئامادەکردنی کورتی لە کۆنگرەکەدا پێویستە سەرەتا هەموو زانیارییەکی بۆ بخەیتە ڕوو لەسەر ئەو بابەتانەی کە پێویستە ئاماژەی پێبدرێت و، ئەو ئەگەرانە لەوانەیە بخرێنە ڕوو، بۆچونی دژی بۆچونەکانی فەرماندە.

٣- ڕیزبەندی پوختەکراوەکان

أ- هیچ نمونەیەکی نوسراو نییە لەبەردەستماندا کە وەك وێنەیەکی فەرمی پوختەی کۆبونەوەکان بخرێتە ڕوو.

ب- پێویستە تێبینی مەرج و یاساکانی نوسینی خزمەتی بەرامبەر بکرێت لەنوسینەکەدا.

خ- ئەتوانی ناونیشانە سەرەکییەکان تۆمار بکەیت و پاشان ناو نیشانی ئەو مادانەی کە قسەیان لەسەر دەکرێت و ئەو کۆمەڵانەی کە ئەتوانی چاو پۆشی لێ بکەیت و باس نەکرێت.

د- پێویستە نوسینەکان کورت و ڕونبن.

ژ- پێویستە دێڕ بپەڕێنیت و بۆ نوسینی تێبینی ئەگەر هەبوو.

٤- <u>پوختی لە زارەکی و خستنەڕوو</u>

أ- مەبەستی سەرەکی لە پوختی یان ڕونکردنەوە بریتییە لە:

یەکەم: گەڕاندنەوەی کات ئەفسەری یەکەم (بەڕێوەبەر- ئەمیندار) وا لێدەکات پێویستیان بە خوێندنەوەی چەند پەڕەیەك نەبێت.

دووەم: ئەفسەری لە پێشینە (بەڕێوەبەر-ئەمیندار) هەڵدەستێت بە ئاراستەکردنی چەند پرسیارێك لەسەر نوسراوەکە و بەکورتی گرنگترین خاڵی تێدەگەیەنێت.

ب- پێویستە ئامانجی کورتی و خستنە ڕوو بەدیهێنانی بابەتێك یان چەند بابەتێك بێت لەم خاڵانەی خوارەوە:

یەکەم: پێدانی زانیاری.

دووەم: بەدەست هێنانی بڕیار.سێیەم: خستنەڕوی پلان و هەڵوەستە.

ت- چەند هۆکارێك هەیە کە پێویستە لەکاتی کورتکردنەوە و خستنە ڕوودا ڕەچاوی بکەیت:

یەکەم: پێشکەشکردنی گونجاو.

دووەم: متمانە بەخۆ بوون.

سێیەم: دڵنیابیت کە گوێیان لێتە.

چوارەم: ئاراستەی ئەوانەی بەردەمی خۆتی بکەیت.

پێنجەم: تۆن و گونجاوی دەنگ.

**شەشەم: دیمەنی شیاوی کەسی.**

**حەوتەم: وەستانی گونجاو.**

**هەشتەم: زمانی جەستەی قسەکەر.**

**نۆیەم: نمایش نەکردن.**

**دەیەم: زمانی خۆشگۆیی و دورکەوتنەوە لە زمانی زبر.**

**٥- کۆنگرە و کۆبونەوەکان**

**أ- پێویستە کۆبونەوە و کۆنگرە بواری مناقەشە و گۆڕینەوەی بۆچونی بەرفراوان بکاتەوە لەسەر هەر بابەتێك بەرژەوەندی تێدابێت.**

**ب- پێویستە لەکاتی پێویستدا بە ڕونی پەیامەکە بگەیەنرێت و، لەکاتی زۆر پێویستدا بەخێرایی کارەکان ڕاپەڕێنرێت.**

**پ- ئەفسەری ڕوکن کە ئەمیندار ڕادەسپێرێت بۆ کۆبونەوە یان کۆنگرە، بەرپرسە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە ئامادەبکرێن بۆ کوبنەوە لە خشتەی کارکردن و نوسینی وتارەکانی کۆبونەوە.**

**ر- زۆربەی کۆنگرە و کۆبونەوە و ڕاسپاردەکان پێویستیان بەهۆکاری شیکاری و ڕونکردنەوە هەیە.**

**ز- مەبەست لە کۆنگرە و کۆبونەوەکان، بریتین لە:**

**یەکەم: دابەشکردنی زانیاری لەسەر کۆبونەوەکان.**

**دووەم: بڕیار لەسەر کارێك کە پێویستە بگیرێتەبەر لەسەر بابەتێکی دیاریکراو.**

**سێیەم: دانانی پەیرەوێکی دیاریکراو بۆ کارکردن.و- کۆنگرەکە بە پلەی یەکەم لەسەر ڕێکخستنی وردی ئەفسەری ڕوکن دەوەستێتەوە، پێویستە ئەم کارانە بگرێتەبەر:**

**یەکەم: هەڵبژاردنی کەشێکی ئارام و گونجاوی دور لە ژاوە ژاو.**

**دووەم: ڕێکخستنی دانیشتن و نوسینی ناوی هەر کەسێك لەسەر کورسیەکەی خۆی.**

**سێیەم: دابینکردنی ئاشتی و ئارامی شوێنەکە.**

**چوارەم: ئامادەکردنی داتاشۆ و کۆمپوتەر و بۆردی تایبەتی کۆبونەوە.**

**٦- کۆنوسی کۆنگرە و کۆبونەوە**

**أ- پێویستە کۆنگرە و کۆبونەوەکان ئەم خاڵانەی تیا بێت:**

**یەکەم: پوختەی گرنگترین مشتومڕەکان.**

**دووەم: تۆمارکردنی ئەو بڕیارانەی دراون.**

**سێیەم: کارکردنی پێویست لەسەر ئەو خاڵانەی پێویستە بگیرێنەبەر.**

**ب- لەکاتی کۆتایی هاتنی کۆبونەوە و کۆنگرە پێویستە:**

**یەکەم: ئەندامانی کۆنگرەکە بە خێرایی چاو بە بڕیارەکانی کۆنوسەکەدا بخشێننەوە.**

**دووەم: بەر لە دەرچونی کۆنوسەکە پێویستە ئەمینداری کۆبونەوەکە وردەکاری بکات لە دەرخستە گشتییەکانی کۆبونەوەکە و ئەو خاڵانەی لەسەری ڕێککەوتون.**

**ج- پێویستە کۆنوسەکە بەم شێوەیە وردبێت:**

**یەکەم: پوختەیی.**

**دووەم: گشتگیری.**

**سێیەم: تایبەتی نەبون.**

**چوارەم: بێلایەنی.**

**پێنجەم: بە ئاوەڵناوی نادیاری (ضغمیر الغائب) بنوسرێت.**

## وەرزی هەشتەم

## چالاکییەکانی

**دەستەی ڕوکن**

١- **ئەرکەکانی هەیئەی ڕوکن**

أ- هاوکاری بەڕێوبەر دەکات لە کاروباری فەرماندەییدا.

ب- هاوکاری بەڕێوبەرایەتیی و یەکەکان دەکات بۆ ئەنجام دانی ئەرکەکانیان.

٢- **بەرپرسیارێتی هەیئەی ڕوکن بەرامبەر بەڕێوەبەر**

أ- فەرمانەکانی پێش دەخات.

ب- زانیاری وردی پێدەدات کە ببنە هاوکاری بۆ دەرکردنی بڕیار.

ح- چارەسەری سەرەتایی و بەبێ درێژەدان لەسەر ئەو شتانەی پەیوەندی بەوەوە هەیە.

خ- پیادەکردنی پلانەکەی بە دەرکردنی فەرمانی درێژ.

د- سەرپەرشتی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی.

ژ- ئەگەر داوایکرد ڕاوێژی پێشکەش بکات یان ئەگەر شتێکی لەیادخست بیری بخاتەوە.

ر- هەمیشە پشتگیری و پشتیوانی بڕیارەکانی بێت، بە لەبەرچاوگرتنی بۆچونی تایبەتی وەك ئەفسەری ڕوکن.

٣- **بەرپرسیارێتییەکانی ئەفسەری ڕوکن بەرامبەر بەڕێوەبەرەکان/ یەکەکان**

أ- بیری بێت ئەو لە خزمەتی بەڕێوەبەرایەتییەکان و/ یەکەکاندایە.

ب- بەشداریکردنی لەسەر کەوتنی هێزە جوڵاوەکان بە ئەرکی شایستەی ئەفسەری ڕوکن بەرامبەر هێزەکان.

ت- سەردانی کردنی بەردەوام و پچڕپچڕ بۆلایان و چاوخشاندنەوە بە کێشەکانیان و بە دڵسۆزی و لەخۆبوردویی کاریان بۆ بکات.

پ- دوربکەوێتەوە لە پێدانی بەڵێنێك کە نەتوانێت جێبەجێیان بکات.

ج- پێدانی زانیاری بە بەڕێوەبەرایەتی/ یەکەکان بەوەی چی جۆرە ڕێوشوێنێکیان گرتوەتە بەر لەسەر کێشەکانیان.

٤- **بەرپرسیارێتی دەستەی ڕوکن بەرامبەر بەخۆیان**

أ- بیرتبێت هەمیشە و کات بەناوی بەڕێوەبەرەوە کار دەکەیت، نەك بەناوی خۆتەوە.

ب- بیرتبێت بەبێ هاوکاری و هەماهەنگی تەواوی بەش و پۆلەکان ناتوانێت کارەکانی بەباشی و لێوەشاوەیی ئەنجام بدەیت.

ح- بەستنی پەیوەندی خۆشەویست و برایەتی لەگەڵ تەواوی کارمەندانی بەڕێوەبەرایەتی بەتایبەت لەگەڵ دەستەی باڵای ڕوکن.

خ- ئامادەیی بۆ گوێگرتن لە کێشەکانی تایبەت بە بەڕێوەبەرایەتی و یەکەکانی دیکە.

د- دوورکەوتنەوە لە شاردنەوەی نهێنی لەنێوان بەشەکاندا.

ژ- هەڵنەهاتن لە بەرپرسیارێتی.

ر- جار جار کۆبونەوە و سیمینار ئەنجام بدە بۆ دەستەبەرکردنی زانیاری نوێ و گۆڕینەوەی بیروبۆچون لەسەر شێوازی کارکردن.

٥- **چالاکییەکانی دەستەی ڕوکن**

أ- ئامادەکردنی نەخشەی کار.

ب- شیکاری.

ت- ێشنیار.

پ- دەرکردنی فەرمان.

ج- سەرپەرشتیکردن.

٦- **کارکردن لەسەر کاری نوسینی ئاسایی**

أ- دیاردەیەکی مەترسیدار هەیە لە زۆربەی دەستەی ڕوکن بونی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە زۆر ڕۆدەچن لە کاروباری بچکۆلەدا بەشێوەیەك کە کارەگرنگەکان لەیاد دەکەن بەشێوەیەك کە زۆر جار پشتگوێی دەخەن. کاری لەپێشینە گرنگەکان.

ب- پێویستە لەسەر ئەفسەری ڕوکن کە لەم ڕێگەیانەوە کات دروست بکات و بیان قۆزێتەوە:

یەکەم: ئەرکی سەرەکی دەستەی ڕوکن هاوکاری کردنی بەڕێوەبەرە بۆ ئەوەی کە بتوانێت بڕیارێکی دروست بدات و لەکاتی خۆیدا بڕیارەکان جێبەجێ بکرێت.
دووەم: پێویستە ئەفسەری ڕوکن درێژەی ئەرکەکانی خۆ بزانێت لەناو یاسای کارکردندا لەناو دەستەی ڕ،کن، بۆ ئەوەی کارەکان لەسەری زۆر ئاسانبێت و بە باشی پیادەیان بکات.
سێیەم: پێویستە سودی تەواو لە تەواوی بەردەستەکانی بکات کە لە ژێر فەرمانی ئەفسەری ڕوکندان، بۆنمونە:

١- دابەشکردنی ئەرکەکان بەشێوەیەکی دروست بەسەریاندا.
٢- رسەرەتا ئەو کارانەیان پێبدات کە زۆر بە پەلەن.
٣- دڵنیابون و جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر بێ کار دادەنیشتن لەکاتی ئەرکی فەرمیدا.
٤- داوا لە بەردەستەکانی بکات کە سەرەتا کارە ئاساییەکان ڕاپەڕێنن تا ڕادێن لەسەر کارەکەیان و ئەزمون پەیدا دەکەن، وەك: نوسینی نوسراو و داڕشتنی نوسین.
٥- لابردنی سەرجەم بەربەستەکان کە لەکاتی کاری ڕۆژانە دروست دەبن.

چوارەم: پێویستە ئەفسەری ڕوکن فێری کرۆکی خوێندنەوەی خێرابیێت، چونکە ئەمە بەشێکی گەورەیە لە گەڕاندنەوەی کات و خێرا گەیاندنی پەیام.
پێنجەم: پێویستە دوربکەوێتەوە لە درێژەدان بە نوسین، ئەوە بزانێت ئامانجی سەرەکی گەیاندنی پەیامەکەیە.

٦- <u>یاسا ئاڵتونییەکان بۆ مشتومڕ لە کۆبونەوەکاندا</u>

أ- پارێزگاری بکە لە گیانی هاریکاری و خستنەگەڕی توانای خۆت لە گوێگرتن و تێگەشتن لە بۆچونی بەرامبەر.
ب- دوربکەوەوە لە هەڵچون و کاردانەوە لەکاتی مشتومڕدا.
ح- وامەکە کە بابەتی گفتوگۆکە بکەیتە کەسی و تایبەت و کارەکە بەرەو تەنگژی و هەستیاری ببەیت.
خ- دور بکەوە لە تەواوی شێوەکانی هێرشکردنە سەر بەرامبەر.
د- لە کاتی کۆبونەوەدا لە بنەمای کۆبونەوە دور مەکەوەرەوە و شتی زیادە مەکە.

٧- <u>ڕێز لە یاساکانی کارکردنی بەکۆمەڵ بگرە</u>

أ- له ئامانجی كۆبونەوەكە دەرمەچۆ.

ب- مشتومڕ قبوڵ بكە وەك بەرپرسی كۆبونەوەكە.

ت- كاتێك كەسێكی دیكە قسە دەكات تۆ قسە مەكە و، دور بكەوە لە بڕینی قسەكردن بەوانی دیكە.

پ- كاتی زۆر تەرخان مەكە بۆ خۆت كە تەنها خۆت قسە بكەیت.

ج- دوربكەوە لەوەی لەكاتی كۆبونەوە لەگەڵ هاوڕێكەی تەنیشت قسە بكەیت.

ح- دوربكەوە لە قسەی زۆر و درێژەدان بە قسەكردن.

خ- پەشیمان مەبەرەوە لەو بڕیارانەی لەسەر ڕێككەوتون.

## بەشی نۆیەم

## لیژنەکان

١- **لیژنەی وردە خەرجی (النثرية)**

أ- ڕێکخستنی ئەو بڕە وردەخەرجییەی هەیە لە فەرمانگە و تۆمارێکی تایبەتی بۆ بکەیتەوە.

ب- وردەکاری و خەرجکردنی تەواوی ئەو وەسڵانەی کە هاتون دوای ڕەزامەندی بەڕێوەبەر خەرجکراون.

ت- خستنەڕووی سەرژمێری مانگانە بۆ داهات لە کۆتایی هەموو مانگێکدا بۆ ئەوەی بەڕێوەبەر پشتڕاستی بکاتەوە.

پ- گواستنەوەی کەرەستە بنچینەییەکان بۆ سەر میلاکاتی ئەو کەسەی بەکاری دەهێنێت و تازە بۆی کرِدراوە.

٢- **لیژنەی کتێبخانە:**

أ- دڵنیابون لەوەی کە کارمەندی کتێبخانە تەواوی ئەو کتێب و کوراسانەی ڕادەستی دەکەیت تۆماری دەکات لە تیانوسی تایبەتی.

ب- دڵنیابون لە ڕێکخستنی کتێبخانە و ڕیزکردنی کوڕاسە و کتێبەکان و دابەشکردنی ڕشتەکان.

ج- دڵنیابون لە بونی تۆمارێك بۆ دوبارە نوسینەوەی کتێب و کوڕاسەکان بەپێش ڕشتەکان.

ح- دڵنیابون لە بونی تۆماری بەدواداچون بە ناو کتێب و کوڕاسەکان و وردەکاری لە یاسای بەدواداچوون بەبەردەوامی.

خ- هەستان بە سەرژمێری کتێب و کوڕاسەکان کە لە کتێبخانەکە بونیان هەیە و پێویستن.

٣- **لیژ جیاکردنەوە و ڕاگواستنی بەڵگەنامەکان**

یەکێکە لەو لیژنە هەمیشەییانە کە کاریان جیاکردنەوە و گواستنەوەی بەڵگەنامەکانە لە کاتی خۆیدا.

٤- **لیژنەی بیناسازی**

ئەوکاتانەی پێك دێت کە پێویستە کەرەستە بنچینەییەکان و باڵەخانەکان پێویستیان بە چاکسازی و نوێکردنەوە هەیە.

٥- **لیژنەی گەنجینە و قاسە**

أ- **پێدانی موچەی ئەفسەر و کارمەندان و دابەشکردنیان.**

ب- **هەمو و ئەندامێك کلیلی تایبەتی خۆی پێیە.**

ت- **پیادەکردنی سەرجەم ڕاسپاردە و فەرمانە ژمێرییاییەکان کە لە سەروخۆتەوە دەردەچێت.**

٦- **لیژنەی مەشق**

أ- **ئامادەکردنی پەیڕەوی مەشق بۆ سەرجەم بەشەکان و مەشقی تایبەت بە پێی پسپۆڕی.**

ب- **ئامادەکردنی هۆکاری زیاتر ڕونکردنەوە.**

پ- **بەردەوامی دان و ئامادەکاری پێداویستییەکانی مەشق.**

ج- **کردنەوەی خولی مەشق بۆ سەرجەم چەکەکان.**

ح- **کردنەوەی خولی مەشقی تایبەت (هەوالّدێری- شۆفێری).**

خ- **هەستان بە ئەنجامدانی پشکنین و بەدواداچون بەسەر کارمەندەکاندا بۆ ئەوەی بزانن بە جوانی و بەدروستی مەشق دەکەن و، بەرزکردنەوەی ڕاپۆرتی درێژ و ورد لەسەر مەشقەکە.**

٧- **لیژنەی یارییەکان**

أ- **ئامادەکردنی گۆڕەپانی خۆ ئامادەکردن و ئامادەسازی و گرنگی دان بە کەرەستە وەزرشییەکان.**

ب- **هەڵبژاردنی یاریزانی باش بۆ سەرجەم تیمەکان و سەرپەرشتیکردنی مەشق و گرتنەبەری گیانی کێبەرکێ بۆ پێشکەوتنیان.**

ت- **کارکردن بەپێی زانیارییەکان لە دابەشکردنی مەشق و یارییەکانی سوپا.**

## دەروازەی دەیەم

## بابەتە یاساییەکان

١- **ئەنجومەنەکانی لێکۆڵینەوە**

ئەو حاڵەتانەی کە ئەنجومەنی لێکۆڵینەوەی بۆ پێك دەهێنرێت:

أ- لەکاتی لەدەست دان یان زیان پێگەیاندن یاخود بەهەدەردانی کەرەستەیەکی سەربازی لەم کاتانەدا دەگیرێتەبەر:

یەکەم: ئەگەر بەهای زیانەکە لە دەرەوەی فەرماندەی دیسپلینی یەکەکەبوو.

دووەم: ئەگەر تاوانەکە بەهۆی کەمتەرخەمی تەواوی کەسەکەبێت.

سێیەم: ئەگەر زیانەکە بەر چەك یان کەرەستەی جەنگی یان ئۆتۆمبیل بێت و، زیانەکەش بەهۆی پشتگوێخستن و مەبەست و کەمتەرخەمی تەواوەبێت.

ب- لەکاتی ڕودانی کورت هێنان لە گەنجینە.

پ- لەکاتی بەهەدەردان یان ونکردنی ئاژەڵێك لەکاتی ئاشتیدا.

د- لەکاتی بەکارهێنان و دزینی هەرمادەیەکی تایبەت بە خزمەتی سەربازی یان فرۆشتنی یاخود شاردنەوەی مادەیەك یان بەکارهێنانی کەرەستەی دەوڵەت بۆ مەبەستی خراپ و هەڵە و لە ڕێگەی نادروست.

ژ- لەکاتی زیان گەیاندن بە یەکێك لە سەربازەکان.

ر- لەکاتی ڕودانی شەڕ و بریندارکردنێکی گەورە.

ز- لەکاتی ڕودانی مردنی گوماناوی.

٢- **پەڕاوەکانی لێکۆڵینەوە**

پێویستە پەڕاوەی لێکۆڵینەوە ئەمانەی خوارەوە لەخۆ بگرێت:

أ- فەرمانی دەرچوو بە لیژنەی لێکۆڵینەوە.

ب- دەرخستە و بەرزکردنەوەی ڕوداوەکە.

ج- نازناو و خشتەی ڕەوشتی و خشتەی کەسایەتی کەکەسە.

د- پسوڵەی ئاماژە دان بە گرتن و بەردانی کەسەکە.

ژ- وتەی لێکۆڵینەوە، سەرجەم ئەو وتانەی کە لە وتووێژەکە تۆمار دەکرێت.

ر- پەڕاوەی لێکۆڵینەوە لە لایەن پۆلیس و مادەی لێکۆڵینەوەکە.

٣- **کارە گشتییەکانی ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە**

أ- لەگەڵ پەڕاوەی لێکۆڵینەوەدا ئەو کەرەستەی کە بوەتە هۆی تاوانەکە و پەیوەندیارە پێیەوە دەینێرین.

ب- نابێت تەنها بە لێکۆڵینەوەی پۆلیس و دادوەر بەسە بکەیت، پێویستە بەردەوامبیت لە لێکۆڵینەوە.

د- ئەگەر دەرکەوت کە شتێکی لەناوبردووە و بوەتە هۆی خراپکردنی کەرەستەیەك پێویستە پێی ببژێریت و مادەی پێبژاردنەکەشی لە بڕیاری لێکۆڵینەوەدا تۆمار بکەیت.

ژ- ئەم شتانە لە ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە باس دەکرێن:

یەکەم: پوختەی دۆسیەکە.

دووەم: بەڵگەی هەبوو یان بونی وتەی شاهید لە دۆسیەکەدا.

سێیەم: بڕیار پاڵپشت بە مادە یاساییەکانی سزادانی سەربازی.

ر- دەسەڵاتی ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە نییە کە جۆری سزاکە و بڕی پێبژاردن دیاری بکات

ز- ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە دەتوانێت ڕاستەوخۆ شاهید و تاوانبارەکە بان بگات و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکات.

س- نابێت ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە زیاتر لەو ماوەیەی کە لە دەقی مادەی (٣٦) یاسای سزادانی عێراقیدا هاتووە تۆمەتبار ڕابگرێت.

ح- سەرۆکی ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە تەواوی پەڕاوەکانی لێکۆڵینەوە ئیمزا دەکات.

خ- نابێت هیچ کەس لە جیاتی هیچ کەس پەڕاوەی لێکۆڵینەوە ئیمزا بکات.

د- پێویستە ئەم شتانە لە گەڵ پەڕاوەی لێکۆڵینەوەدابن:

یەکەم: کۆپییەك لە باری کەسێتی و ڕەگەزنامە و نوسراوی موختارەك لە هەندێك کێشەدا.

دووەم: لیستی مۆڵەت و نەهاتن و گەڕانەوەی سەرجەم ئەو شتانەی کە ون بوون.

سێیەم: پەڕاوەی چاککردن و نەخشەی ڕوداوەکە و دەرخستەی پۆلیسی هاتوچۆ ئەگەر بابەتەکە ڕوداوی هاتوچۆبوو.

چوارەم: بەڵگەی مردن لە بابەتی کوشتن.

پێنجەم: وێنەیەك لە ڕاپۆرتی پزیشکی.

## وەرزی پانزەیەم

## جیاکردنەوە و پاراستنی و دورخستنەوەی بەڵگەنامە سەربازی

١- **بەڵگەنامە سەربازییەکان**

سەرجەم نوسراو و تۆمار و کوڕاسە و نەخشە و جانتا و تیانوس و وتار و فلیم و وێنە و کاسێتی دەنگی و بەڵگەنامەی گرتن و گواستنەوە و پەیوەست بە لایەنە مادی و مەعنەوییە و کەلەپوری سەربازی هەیە دەیگرێتەوە.

٢- **پۆلێنکردنی بەڵگەنامەکان**

پۆلێنکردنی بەڵگەنامەکان بە مەبەستی پاراستن و لەناوبردنیان بە گوێرەی لیستی (أ-ب-ج) و بەم شێویە دەبێت:

أ- چینی (أ) ئەو بەڵگەنامانە دەگرێتەوە کە پێویستە بپارێزرێن و، بەهۆی گرنگیان لەناو دەبرێن.

ب- بەشی (ب) ئەو بەڵگەنامە گرنگانەن کە پێویستە تۆمار بکرێن و دوای تێپەڕبونی ساڵێك ئەتوانرێت لەناوبدرێن.

بەشی (ج) ئەو بەڵگەنامانەن کە هیچ گرنگ نین و پێویست بە تۆمارکردن و ناکات و پێویستە دوای تەواو بونی ساڵەکە بە ئامادەبونی لیژنەیەك بسوتێنرێت.

٣- لیژنەکە هەڵدەستن بە دانانی بەشی (ج) و دەیخەنە ناو کیسەیەك یان کارتۆنێك، دواتر دەخرێنە ناو پارچەیەکی دیکە وەك پاشکۆی ژمارە (٢) تا دوای وردەکاری و بەدواداچون و وێنەیەك لە ڕەزامەندی نابێت بسوتێنرێن.

٤- دوای پرۆسەی جیاکردنەوە و پۆلێنکردنی سەجەم بەڵگەنامەکان وەك نمونەی (١) و (٢) کۆتایی ساڵ نمونەیەك لە کۆتا جیاکردنەوە بەڵگەنامەخان دەخەینە ڕوو بۆ لەناوبردن یان هێشتنەوە، وەك لە بەشی (ج) باسمانکرد.

٥- لیژنە سەرەکییەکە هەڵدەستێت بە ناردنی بەڵگەنامەکانی (أ،ب) کە وردەکاریان تیاکراوە و ڕاستێنراون لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی تایبەت بەو دۆسەیە، وەك نمونەی ژمارە (٢) بەپێی دانانی پلانێکی کاتی کە لیژنەکە سەرپەرشتی دەکات، بەو مەرجەی دۆسیەکان نەگەنە (١٠٠) دۆسیە.

**وەرزی پانزەیەم** **پاشکۆی (أ)**

بەشی (أ) ئەو بەڵگەنامە دەگرێتەوە کە زۆر گرنگن، پێویستە تۆماربکرێن و هەرگیز نوسخەی ڕەسەن (اصلی)یەکە لەناو نەدەیت، کە بریتین لە:

١- ئەو یاسا و ڕێکخستن و فەرمان و فێرکاری و ڕونکردنەوە و چاکسازیانەن کە دەردەچن لەلایەن بارەگای سەرەکی و ئەنجومەنی بەرگرییەوە، یان لە ڕاوێژگاری یاساییەوە دەردەچێت.

٢- بەڵگەنامە و فێرکارییە ژمێریارییەکان بەڕێوەبەرایەتییەکان و وردەکاری و وردبینین بابەتی ژمێریاری و ئەو دۆسیانەی کە گرنگی زۆریان هەیە لە ڕوی داراییەوە و بەڵگەنامەی دەرماڵەکان و ڕاپۆرتی موچە.

٣- فەرمانەکانی بەشی دوو.

٤- تۆماری دارایی و تۆمارەکانی گەنجینە و دامەزراو و، کڕین.

٥- کتێب و قاموس و تۆمارەکانی کتێبخانەی بارەگا و بەڕێوەبەرایەتییەکان و یەکە و دامەزراوەکانی سەر بە دەزگاکە.

٦- لیستی وەرگرتن و ڕادەستکردن (دەور والتسلیم).

٧- مامەڵەی لەناوبردنی کەرەستە خراپبوەکان کە پەیوەندی بە پێشینەی نەخشەوە هەیە.

٨- گرێبەست و ڕێکەوتن و کۆنگرەی سەربازییەکان.

٩- تۆمارە بنەڕەتییەکانی سکاڵانامە و تۆمارە جۆراو جۆرەکانی دادگایی سەربازی و بڕیارە ئەزمونیەکان و حوکمە دەرچووەکان.

١٠- بەڵگەنامەکانی ئاسایش و هەواڵگری و سەرجەم ڕاپۆرتە نهێنییە تاکییەکانی سەر بەبەشە گرنگەکان.

١١- تۆماری چەك و تەقەمەنی و بەڵگەنامە و پێشینەکانیان.

١٢- فەرمانی پێکهێنانی لیژنە بۆ یەکەکان و هەڵوەشاندنەوە و گۆڕینی ناوەکانیان.

١٣- میلاکات و کارمەندەکانیان.

١٤- ڕەگەزنامە و ناسنامە و کارتی تایبەت دەرچوو لە تۆمارە مەدەنی و بڕوانامەی تایبەتی.

١٥- پەیڕەوی گشتی دانیشتوانی سەر بە وەزارەتی بەرگری و دابەشکردنی ناوچەکان لەکاتی ئاشتیدا.

١٦- جۆرەکانی ڕێگە و پرد و بەرزەپرد و پۆلێنکردن و ڕاپۆرتی گرنگ لەسەریان.

١٧- سەرجەم جۆرەکانی نەخشە و پلانەکان بۆ مەبەستی جوڵان.

١٨- نەخشەی کۆبونەوە و سەنگەرسازی و گۆڕانکاری گشتی.

١٩- نەخشەی بەکارهێنانی زەمین و ئاسمان و ڕوبار و بەشە سەربازییەکان.

٢٠- نەخشەی پاراستنی دامەزراوە سڤیلەکان.

٢١- ڕاسپاردەی جوڵە هاوبەشەکان و ڕاپۆرتی کاتی.

٢٢- نەخشەی بەردەوامی دان بە کارگێڕی و بەڕێوەبردن.

٢٣- نەخشەی گەنجکردنی مادە بژێو و ڕزگارکردن و مادە پزیشکییەکان و ڕێکخستنی گەنجینەکان.

٢٤- نەخشەی ڕێکخستنی پلانی کارگێڕی بۆ بنکە ئاسمانی و دەریایی و ناوچەکانی گەیاند و گرنگی پێدانیان.

٢٥- ئەنجامی کۆلێژە سەربازیی و ئەرکان و کۆلێژ و خوێندنگەکانی دیکە.

٢٦- زانیاری لەسەر کارمەندانی ناو بەڕێوەبەرایەتییەکان.

٢٧- توێژینەوەکان لەسەر بیروباوەڕی سەربازی نوێی عێراق.

٢٨- بەندا و گەنجینەی گلدانەوەی ئاو و ڕێڕە و جۆگە دەستکردە ئاوییەکان و، دامەزراوە نەوتییەکانی دەرەوە و نزیکی شارەکان و، هێڵەکانی کارەبا.

٢٩- بابەتی ڕوپێوی زەمین لەزرە و جیۆلۆجی و کەش و هەوا و قەڵا و پرۆژە گرنگەکانی شار و دەشتەکان.

٣٠- هەر بەڵگەنامەیەك کە لیژنەکان بە گرنگی دابنێن و دوای ئەوەی پشکنینان بۆ دۆسیەکان کرد ئەو دۆسیانەیان گەڕاندوەتەوە، بە گوێرەی ڕاپۆرتی لیژنەکە.

٣١- کۆکردنەوەی سەرجەم ئەو بەڵگەنامانەی کە لەسەر دۆسیەی کەسی کارمەندە خانە نشین و شەهید و بەندکراوەکانن.

پۆلێنی بەشی (ب) ئەو بەڵگەنامە گرنگانە دەگرێتەوە كە پێویستە تۆمار بكرێن و دوای تێپەڕبونی ساڵێك بەسەریدا لەناو ببرێن.

١- تۆماری بەریدی هاتوو و ڕۆشتوو لە فەرمانگەی سەرەكی و بەڕێوەبەرایەتییەكانی دیكە و لیژنەی یەكەكان.
٢- لیستی گواستنەوەی هاتوو ڕۆشتوو و تۆمارەكانی ئەستۆ پاكی و تۆمارەكانی سەرژمێری ڕۆژانە.
٣- پەڕاوەكانی سكاڵا و دادگاكان و دۆسیەكان.
٤- فێركارییەكانی پرۆسەی سەرژمێری و نمونەی پەیوەندیدار پێیەوە.
٥- كۆنوسی تەقەكرد و تۆمارەكانی زیادكردنە ئاشكراكان.
٦- پرۆژەكانی ژێرخان دوای تەواوبونی كارەكانیان ئیدی كارەكان وەرگیرابن یان دوبارە كاری تیا بكرێت.
٧- شیكاری مەشقی شیاندن.
٨- بەڵگەنامەكانی (١و٢) دوای وردەكار و دڵنیابونەوە لە بەڵگەنامەكانی خەرجكردنی چەك و تەقەمەنییەكان و كەرەستە هونەرییەكان.
٩- دۆسیەكانی ئەنجومەنی لێكۆڵینەوە جۆراوجۆرەكان هەرچی تایبەتیشە بە ئەستۆپاكی و بەكارهێنانی ماڵی دەوڵەت.
١٠- دۆسیەی تایبەت بە گەنجینە و كەرەست و فرۆشتنی ئۆتۆمبیل و زیادكراوە ئاشكراوەكان.
١١- تۆماری پەڕاوەی گرێبەستە دەرەكیی و ناوەكییەكان دوای تێپەڕبونی ماوەیەكی گونجاو لە پێكهێنانیان و لایەنەكانی پەیوەندی دار بە گرێبەستەكە.
١٢- وەسڵی گرتن و ئەوەی كە پەیوەندی حوكمدانەوە هەیە.
١٣- مامەڵەی گواستنەوەی چەك و كەرەستەی جەنگی.
١٤- دۆسیە و مامەڵەی بابەتەكانی بژێوی لەلایەن كەسەكانی پەیوەندیدار بە ڕێكەوتنەكان و كۆمپانیا و دامەزراوە حكومی كارگەكان.
١٥- مامەڵەی گواستنەوەی وشكانی و دەریایی و ڕوباری و بارهەڵگر و لیستی ئاو و كارەبا و پەیوەندی تەلەفونی، وەسڵی دڵنیابونەوە لە چۆنێتی خەرجكردنی سوتەمەنی و پێكهاتەكانی.
١٦- خشتەی خواردەمەنی و بەنزین و ئەو ڕۆنانەی كە لەناو دەچن، دوای وردەكاری كردن لێیان.
١٧- دۆسیەی گۆڕینی پیشە و ڕشتە و دابەزین و موچە و هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەكان.

١٨- مامەڵەی دابینکردنی مادە یەدەکەکان و مامەڵەکانی گۆڕینی کەرەستەی ئۆتۆمبیل.

١٩- ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە لە ئالیات و چەك و تەقەمەنی و کەرەستە گرنگەکان.

٢٠- خەرجکردنی تەنکەر و گەنجینەی ئاو و سوتەمەنی و کەرەستەی کوژاندنەوەی ئاگر.

٢١- نەخشەی گەنجکردن و پێچانەوە.

٢٢- تۆماری سەرژمێری بەنیز و ڕۆن و تۆماری مانگانەی خەرجکردنی سوتەمەنی ئۆتۆمبیلی مەدەنی.

٢٣- نمونەی دەرخستەی دەرماڵەکان و دۆسیە جۆراو جۆرەکان و ڕوداوەکانی حەفتە و ئەو مادانەی کە دەکرێت لە ناو بچن.

٢٤- دۆسیەی فرۆشتنی موڵکو ماڵی دەوڵەتی سەر بە یەکەکە کە پێویستە بنرخێنرێن و دۆسیەی گرتن و لەناوبردن.

٢٥- مامەڵەی خەرجکردنی کەرەستە ئامادەکارییەکان و تابلۆی هاتو و ڕۆشت و تۆماری بلانجو (٢٤٤).

٢٦- مامەڵەی پێچانەوەی دەستکەوت و مامەڵەکانی پەیوەندیدار بە دوبارە بەکارهێنانەوەی چەك و مادە هونەری و مادە یەدەکەکان و کەرەستەکانی ناو گەنجینە.

٢٧- تۆماری شیاوێتی کەسەکان کە لە ڕاپۆرتی پشکنەرەکاندا هاتووە.

٢٨- دۆسیەی تایبەت بە خوێندکارانی کۆلێجە سەربازییەکان و وەرگیراوەکان و گوازراوەکان بۆ وەزارەتەکانی دیکە و، پێدانی پلە و هەرچی پەیوەندی بە تاقیکردنەوەوە هەیە.

٢٩- مامەڵەی خەرجی هاوکارییە داراییەکان بۆ بابەتی تەندروستی و مامەڵەی چارەسەر لە دەرەوەی وڵات و ڕۆشتن و دەرچون لە نەخۆشخانە و بۆ ئەفسەر و کارمەندەکان.

٣٠- دۆسیەی هاوکاری بۆ دەرەوەی وڵات و وڵاتانی دراوسێ بۆ مەبەستی مەشق.

٣١- بەشی دوو /بەشی وردبینی میرە/ تۆماری پێبژاردنەکان.

٣٢- دۆسیەی کڕین و فرۆشتنی مادەکانی حانوت و خەرجی فەرمانگە.

٣٣- تۆماری مەشق و ڕاهێنانی کۆلێژەکانی سەربازی.

٣٤- نوسینگەی سەر بە میلاکات و ڕاپۆرت و هەڵسەنگاندنی ساڵانە و دۆسیە و دەرخستەی کارمەندەکان و ڕاپرسییەکان.

٣٥- دۆسیەی وەرگێڕانی پەرتوك و کوڕاسەکان و راپۆرتی گەشە پێدان بە جێبەجێکردنی ناوەڕۆکەکایان.

٣٦- دۆسیەی تایبەت بە گۆڕەپانی تەقەکردن و نمونەی تەقەکردن و ڕێکخستنی تەقەکرد.

٣٧- پەیڕەوی مەشق و بڵاو کردنەوەی ڕاپۆرت و پەیڕەوی کارکردن و مەشق و لە یەکە و پێکهاتەکانیان.

٣٨- تۆماری کەرەستەکانی یەکە و کەرەستەکانی ئەفسەر و کارمەندان و تۆماری پۆشاك و کەرەستەکانی هێنان وەك نمونەی تایبەت لە هەر شتێك بۆ مەبەستی نمونەی ئەو کالاَیە.

٣٩- دۆسیەی ئاگادارکردنەوەی بەشە سەربازییەکان و ئامادەی بەریانیان و ئێواران و بەیاننامە و ڕاپۆرتی ڕۆژانە

٤٠- چالاکی ڕاگەیاندن و بابەتی پلاو کردنەوەی ڕاپۆرت.

٤١- چالاکی نەیاران و ئامادەکاری بۆ هەرکارێك کە ئەگەری ڕودانی هەیە.

٤٢- چالاکی جەستەی شەهیدەکان و مامەڵەی بەندییەکان و بێ سەرو شوێنان و چالاکی جەنگی.

٤٣- فەرمان و ڕاسپاردە و چالاکییەکانی هێزی ئاسمانی.

٤٤- ڕاپۆرتی مەشق و ڕاهینانی سالاَنە.

٤٥- مامەڵەی نەهاتن و هەڵهاتن.

٤٦- تۆماری خشتەی تایبەت بە هاوردەی دەرمان و کەرەستە پزیشکییەکان.

٤٧- هەر تۆمارێکی گرنگ کە لیژنەکان بینیویانە.

**وەرزی پانزەیەم** **پاشکۆی (ج)**

بەشی (ج) ئەو بەڵگەنامە ناگرنگانە دەگرێتەوە کە پێویست بە تۆمارکردن ناکات پێویستە دوای تێپەڕبونی (١-٥) ساڵ لەناویان بەریت:

١- دۆسیەی تایبەت بە شتە سوتاوەکان و بەرمیلە بەکارهاتوە بێکەڵکەکان و لیستی فرۆشراوەکان کە بۆ لەناوبردن دانراون.

٢- ڕوداوەکانی ڕۆژە پشووەکان.

٣- تۆماری هاتو و ڕۆوشتوی پاتری و تایە بەکارهاتوەکان و ئەو نمونانەی بۆ کڕین لیستیان بۆ کراوە.

٤- نمونەی لیستی کارکردنی ڕۆژانەی شۆفێرەکان و تۆماری سەرپێچییەکان.

٥- ڕاگەیاندنی تایبەت بە تۆمار بەنزین و ڕۆن و پێکهاتەکانیان.

٦- مامەڵەی پڕکردنەوەی ئاگرکوژێنەوەکان و ڕاسپاردە و ئامۆژگاری چۆنێتی کۆنتڕۆڵکردنی ئاگر.

٧- لیستی خواردنی ڕۆژانە و خشتەی دابەشکردنی خۆراك.

٨- مامەڵەی فرۆشتنی ئازوقە و لیستی سەرژمێری ئازوقە و وردبینی کردنیان.

٩- ڕەزامەندی تایبەت بە دیاریکردنی بەشە ئازوقە و ناردن و گواستنەوە جۆراو جۆرەکانی بۆ جێگەکانی دیکە.

١٠- نوسینی تایبەت بە ئاهەنگ و بۆنەکان و یاد و یاری و پێشبڕکێ و ڤێستیفاڵەکان.

١١- پێشنیاری مەشق و وانەی کۆن و وەرگێڕانی کوڕاسە و نوسینە بیانییەکان.

١٢- هەڵوەستەی چەکەکانی تەقەکردن و مەشق و داواکاری گرتنی شوێنی تەقەکردن و ڕەزامەندی نواندن لەسەر تەقەکردن.

١٣- نوسراوی تایبەت بە ئاهەنگە فەرمییەکان و دابەزین و کاتی ئەرکبینین.

١٤- دەرخستەی ئێشکگری ئەفسەران و نوسراوی تایبەت بە سزادان و پابەندکردن و ئەرکە جۆراو جۆرەکان.

١٥- نوسراوی تایبەت بە مۆڵەتی ئەفسەران و جێگری ئەفسەر و کارمەندان و لیستی تەنسیبەکان و کارکردن لەسەر نوسراوەکان دوای ئاماژەپێدانیان بۆ دۆسیەکانیان.

١٦- تۆماری ڕێکخستنی نوسراوەکانی پابەندکردن (الچبگ) دوای ئەوەی لە فەرمانەکانی بەشی دوودا ئاماژەمان پێداو و دیاریمان کردن.

١٧- فەرمانەکانی بەشی یەکی یەکەکان و ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە و داخستنی و سکالاّ و تۆماری پوختەی لێکۆڵینەوە.

١٨- کۆپییەك لە خشتەی پلەبەرزکردنەوە و دەرخستنی کارمەندان و هەڵسەنگاندنیان.

١٩- دۆسیەی وێنەی تیشکی پزیشکی و سەردانی نەخۆشخانە و نمونەی مۆڵەتی نەخۆشی.

٢٠- دۆسیەی نەهاتن (الغیاب) و هەڵهاتن و، پەیوەندیکردن و ئەنجومەنی لێکۆڵینەوە کە بەستراون لەسەر کارمەندان.

٢١- تۆماری پەڕاوەی پلاّوکراوەکان و ڕاگەیاندن و ڕوداوە بەپەلەکان و کەتەلۆگی دێرین کە سودێکیان نەماوە.

٢٢- مامەڵەی تایبەت بە پەڕاوگە (القرگاسیە) کوڕاسەکان.

٢٣- دۆسیەی سکالاّ دەرەکییەکان و خشتەی مانگانە و نوسراوی مانگانەی دادگاکان و لیستی بژێوییە شەرعییەکان (النفقات الشرعیە).

٢٤- هەواڵدێری و هەرچی پەیوەندی بە جولاّن و نهێنی شەوانە و خشتەی کارە بەپەلەکان هەیە.

٢٥- تیانوسی دابەشکردنی موچە و بەرید و دەرماڵەکانیان.

٢٦- بلاّو کراوەکانی سەرژمێری و سەردانیە بەیانیەکان.

٢٧- مامەڵەی کارکردنی کالاّکان و چاککردنەوەیان و مامەڵەی پشکنین چەك و کەرەستە هونەرییەکان.

٢٨- نوسراوی بروسکە و مامەڵە کارگێڕییەکان کە دواتر هیچ گرنیگان نامێنێت و ئەو تۆمارانەی کە لیژنەکان بینویانە و ئێستا گرنگییەکی ئەوتۆی نەماوە.

٢٩- هەر بەڵگەنامەیەکی دیکە کە لیژنەکە بینیویەتی و وتویانە گرنگی نییە.

٣٠- بەڵگەنامەی تایبەت بە دۆسیەی خزمەت و دۆسیەی خانەنشین.

أ- پێدانی مۆڵەتی گەڕانەوە.

ب- گواستنەوە و پەیوەندیکردن.

ت- بەڵگەنامەی نوێکردنەوەی ناسنامە.

ژ- سزاکان.

ر- نوسراوی پابەندکردن.

ز- نمونەی ئەو کەسانەی شیاوی پلە بەرزکردنەوەن.

س- دیاریکردنی بەهرەمەندییەکان.

ش- دەرئەنجامی پشکنینی دەسپاکی.

ص- دەرخستەی دەرماڵەکان.

چ- نوسراوی یەکە کە پێویستە بنێردرێن بۆ سەر لیستی خانەنشینی.

گ- داواکاری بۆ کاتی خانەنشینی مەدەنی و گرێبەستەکان.

٣١- نوسراوی فەرمانگە سڤیل (المدنیە) بەهۆی ناردنی ئەو خزمەت و بەرهەیەی لەوێ هەیان بووە بۆ ناو دۆسیەکەی.

تێبینی: بەڕێوەبەرایەتی ئەگەر ویستی تۆمارێك ئەرشیف بكات پێویستە بگەڕێتەوە بۆ بڕگەکانی (أ-ب-ج) بۆ مەبەستی پۆلێنکردنیان و دانانیان.

**وەرزی پانزەیەم** **پاشکۆی (د.)**

**تێبینی دەبارەی پڕکردنەوەی نمونەی ژمارە (١)**

**١- مەبەست لە یەکە: ئەو یەکەیە کە کاری دابەشکردن و دورخستنەوەی تۆمارەکانی لە ئەستۆدایە.**

**٢- مەبەست لە لیژنە: ئەو لیژنەیە کە هەڵدەستن بە پێداچونەوە بە دۆسیەکاندا و وپۆلێنیان دەکەن.**

**٣- زنجیرە بەندی: زنجیرە بەندی و ڕیزکردنی دۆسیەکانی یەکەکەیە.**

**٤- دەروازە: ئەو بابەتە فەرمیانەن کە بۆ بابەتێکی تایبەت کراونەتەوە، وەك دۆسیەی بەڕێوەبردن و میرە.**

**٥- وەرز: ئەو بابەتانەن کە تایبەتن بە بابەتە سەرەکییەکانی وەك (جوڵان و هەوالگری) پێ ڕاگەیاندن و فەرمانەکانی تایبەت بە بابەتە سەرەیەکییەکانی خاڵی (٤)ی سەرەوە.**

**٦- لق بەشێکە لە وەرز، تایبەتە بە ڕاپۆرتی جوڵان کە تایبەتە بە بەشی گشتی جوڵان.**

**٧- ژمارە و کاتی دۆسیەکان: واتە، دەروازەی یەکەم کارگێڕی و میرە، دەروازەی دووەم جوڵان و، دەروازەی پێنجەم ڕاپۆرتی جوڵان و هتد.**

**فەرمانگەکان بەپێی ئەو ڕیزبەندییە کاری لەسەر دەکەن کە لە ژمارەی دۆسیەکاندا هاتووە.**

**٨- ناوی دۆسیەکان ئەو لیستەی کە لەسەر ڕوی پێشەوەی دۆسیەکان دەنوسرێت وەك ڕاپۆرتی جوڵان.**

**٩- ژماردنی ئەو بەڵگەنامانەی لە دۆسیەکەدا هاتوون، کە ژمارەی پێویستن لە سەرجەم تۆمارەکانی دۆسیەکە لەسەرجەم پلەکانی پۆلێنکردندا.**

**١٠- پلەی تۆماری بەڵگەنامەکان: ڕیزبەندی پۆلێنکردن و هەڵسەنگاندنی بەڵگەنامەکان و ئەوانەی لە بەڵگەنامەی یەکەدا بونیان هەیە و، پێویستە کە پلەکان پڕبکرێنەوە، بۆنمونە ڕێگەی ئاماژە پێدانی خانەی (أ) ٢٠٠ تۆمار.**

**أ- سێ دۆسیەی کارتۆنی دەکەینەوە و پلەی (أ/ب/ج)یان پێ دەدەین.**

**ب- دۆسیە سەرەکیەکە دەکەینەوە و هەموو تۆمارەکان هەڵدەسەنگێنین وەك لە بەشەی سەرەوە (أ) ئاماژەمان پێدا و هەموو یەکێکیان دەخەنە ناو دۆسیەی تایبەتی خۆی.**

ب- دوای تەواو بونی پرۆسەی هەڵسەنگاند بۆ سەرجەم بەڵگەنامەکان و جیاکردنەوەی سەرجەم تۆمارەکان بەشێوەی بەشی (ج) پاشکۆی نمونەی (٢) تۆمار دەکەین.

ج- دوای ڕاکێشانی سەرجەم تۆمارەکانی (ج) لەگەڵ نمونەی ناوەڕۆکی ئەو دۆسیانەدا، دەیان خەینە ناو کارتۆنی تایبەت و کیسی نایلۆن.

ح- دوای پێچانەوەی تۆمارە سەرەکییەکان و بەشێوەی لەکۆتایدا ئاوای لێدێت:

١- بەرگی دۆسیەکە.

٢- سەرجەم ناوەڕۆکی پۆلێنی (أ).

٣- سەرجەم ناوەڕۆکی پۆلێنی ( ب).

٤- کۆپییەك لە ناوەڕۆکی پۆلێنی (ج).

د- پەڕەیەکی جیاکەرەوە یان کاغەزێکی ڕەنگاو ڕەنگ لە نێوان هەموو پۆلێنەکان دادەنێن و ناوی پۆلێنەکان و بەم شێوەیە (١-٨٠) یان زیاتر ڕیزبەندیان دەکەین.

ژ- سەرجەم دۆسیە جیاکراوەکان دەنێرین بۆ لیژنەی فەرمی و سەرەکی بۆ مەبەستی وردەکاری بۆ مەبەستی ڕەزامەندی نواندنیان بەم شێوەیە:

١- لەناوبدرنی ناوەڕۆکی پۆلێنی (ج).

٢- گواستنەوەی بەڵگەنامەکانی زنجیرە (ه) بەڕێوەبەرایەتی تایبەت بە مەبەستی پاراست و تۆمارکردنیان.

## وەرزی دوانزەیەم

## ڕاسپاردەی ئاسایشی

١- **بەرپرسیارێتی ئاسایشی**

بەرپرسیارێتی ئاسایش و پاراستن پرۆسەیەکە پێویستە بە پیادەکردن هەیە بەهۆی ڕاسپاردە ئەمنییە جێگیرەکانەوە کە لەلایەن فەرماندەی باڵاوە دەردەچێت و پێویستە پیادەبکرێت و چاودێری پیادەکردنی بکرێت، ڕێوشوێنی تایبەتیە بۆ بگرینە بەر بۆ ئەوەی دەرفەت نەهێڵینەوە بۆ ئەوەی دزە بکاتەدەرەوە و، پاراستنی ئەرکی سەرشانی هەمو ئەفسەر و کارمەندانە، بەڕێوەبەری فەرمانگە بە هاوکاری ئەمیندار بەرپرسی یەکەمە بەرامبەر ئاسایشی.

٢- **ئاسایشی بەڵگەنامەکان**

أ- دزەپێنەکردنی بەڵگەنامە زۆر گرنگەکان کە هەڵگری زانیاری ئاسایشی ناوخۆی لە ئەستۆدایە و ئەگەر ئاشکرابێت ئاسایشی ناوخۆی وڵات دەخاتە مەترسییەوە.

ب- باسنەکردنی ئەو نهێنیانەی کە دێتەبەردەست بۆ هیچ کەسێك.

خ- لەناودانی سەرجەم بەڵگەنامەکانی تایبەت بەدۆسیە نهێنییەکان.

د- داخستنی تەواوی سەرجەم گەنجینەی تایبەت بە دۆسیەکان.

ژ- دابینکردنی پاسەوانی بۆ فەرمانگەکە.

ر- بەدواداچونی وردەکاری لە ناسنامەی سەردانی کەران و دڵنیابون لە ناسنامەی کارمەندەکان.

٣- **ئاسایشی کەل و پەل**

أ- دڵنیابیتەوە لەوەی کە لەلایەن کەسانی نهێنی پارێز دەستکاری دۆسیەکان دەکەن و، لای کەسانی نهێنی نەپارێز باس نەکرێن.

ب- چاودێری ئەو کەسانەی کە گومانیان لەسەرە و دورخستنەوەیان لە شوێنی هەستیاری.

ت- چاودێری ئەو کەسانەی کە ئۆتۆمبیلی سەربازی بەکاردەهێنن.

٤- **ئاسایشی پەیوەندییەکان**

أ- چاودێری ئەو کەسانە بکە کە پەیوەندییەکان بەکاردەهێنێت و بەبێ تەل قسە دەکات.

ب- بەکارهێنانی هۆکارەکانی پەیوەندی حکومەی بۆ کاری تایبەتی فەرمانگە و دور لە کاری تایبەت.

پ- بەكارهێنانی بەئاگایی بۆ هێڵەكانی پەیوەندی و تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان.

٥- **ئاسایشی تاكەكان**

أ- چاودێری سەرجەم كارمەندانی فەرمانگە بەپێی فێركارییە ئەمنییەكان و بەكارهێنانیان لەكاتی پێویست.

ب- نەهێشتن و بەگژاچونەوەی دەنگۆ و بانگەشە و جەنگی دەرونی دوژمن كە كاریگەری لەسەر مەعنەویەتی هێزەكەت دەكات.

ج- چاودێریكردنی ئەو كەسانەی كە گومانیان لەسەرە و، هەست دەكەیت كە لەگەڵ دوژمن پەیوەندیان هەیە.

ز- چاودێری ورد و چڕ خستنە سەر ئەو كەسانەی كە لە شوێنە هەستیارەكانن.

س- باسكردنی چۆنێتی پاراستنی نهێنی و زانیارییەكانی ناو فەرمانگە بۆ كارمەندەكان و، خۆ دورخستنەوە لە دزە پێكردنی زانیارییەكان.

ش- فێركردنی تاكەكان بەوەی كە دڵنیابنەوە لەوەی هەر زانیارییەك بەبەردەستەكانیان دەڵێن و لەكاتی پێدانی زانیاری زیادەڕۆیی نەكەن لە پێدانی فێركاری ناپێویست و داوانەكراو

ص- چاودێری خستنە سەر شۆفێرەكان و ئەو كەسانەی نوێنەری فەرمانگەكەت.

٦- **ئاسایشی زانیاریەكان**

أ- پارێزگاریكردن لە بەڵگەنامە سەربازییەكان و ئەو نوسراوانەی كە پلەی نهێنیان دیاری كراوە و، لە ئاستێكی نهێنی بەرزدان.

ب- چاودێری چڕ خستنە سەر ئەو شوێنانەی كە تایبەتن بە پاراستنی ئەو زانیاریانە و، ڕێگریكردن لە دزەپێكردنیان بۆ دوژمن.

ح- دورخستنەوەی ئەو كەسانەی كە گومانیان لەسەرە لەو ناوچانە.

خ- پێدانی ئەفسەری هەواڵگری فەرمانگە لەكاتی بونی دزەپێكردنی زانیارییەكان.

د- دڵنیابەرەوە لەوەی كە هەرگیز و بەهیچ شێوەیەك دۆسیە و تۆماری و نەخشەی تایبەت لە شوێنی تایبەتی خۆی نەبێت بەجێی ناهێڵین و، دڵنیابتەوە لەوەی كە سەرجەم كەرەستە و كۆمپیوتەر و ئامێری كۆپیكردنت كوژاندوەتەوە.

ژ- چاودێری كردنی ئەو دۆسیانەی كە دانراون بۆ لەناوبردن لەلایەن سەرۆكی لیژنەی لەناوبردنەوە.

## وەرزی سیانزەیەم

## ڕاسپاردەی ئاگرکوژاندنەوە

١- **گشتی**

ئاگر كاریگەری دەرونی و ورەیی و جەستەیی لەسەر كەسەكان دروست دەكات و هەروەها كاریگەری لەسەر كەرەست و كەلوپەل و پێداویستییەكانی فەرمانگە دروست دەكات، هەروەها كاریگەری نەرێنی لەسەر بەهەدەردانی پێداویستییەكان بەشێوەیەكی گشتی یان بەشێوەیەكی لاوەكی لەسەر كەرەستەكان دروست دەكات ئەگەر لەناویان نەبات، ئەوە دەبێتە هۆی لەكەداركردن و شوێواندنیان، هەندێكجار دەبێتە هۆی زیانی زۆر لەسەر بەڵگەنامە و كەلو پەلی پێویستی فەرمانگاكە.

٢- **هۆكارەكانی ئاگركەوتنەوە**

أ- بریسكەی كارەبا و شۆرتی ناو وایەرەكان.

ب- پاشماوەی جگەرە.

ت- گەرمكەرەوە و ساردكەرەوە.

پ- هەر هۆكارێكی دیكە كە كارەبای تیابێت و شیاوی ئاگركرتنبێت.

٣- **هۆكارەكانی خۆ پارایستن لە ئاگر كەوتنەوە**

ئاگر پێویستی بە سێ ڕەگەزی سەرەكییە بۆ كەوتنەوەی، ئەوانیش: (هەوا، كەرەستەی ئاگرگرتن، ئاگر) بۆ كۆنتڕۆڵكردنی پێویستە یەكێك لەم سێ شتە لابەیت، دیارە توانای لابردنی ئاگرەكە ئەستەمە و زۆرجاریش ناتوانین كەرەستە ئاگرگرتوەكە لابەرین، باشترین چارەسەر كۆنتڕۆڵكردن و بڕینی ئۆكسجینە لە دەورو پشتی ئاگرەكە. گرنگترین هۆكارەكانی خۆپارێزی:

یەكەم: جگەرە نەكێشان لەناو نوسینگە و ژوری كاركردن.

دووەم: بڕینی كارەبا لە شوێنە هەستیارەكان.

سێیەم: چاككردن و بڕینی كارەبا لە شوێنە مەترسیدارەكان.

چوارەم: بونی ئاگركوژێنەوە لە ژورەكاندا و پشكنین و بەدواداچون بۆ ئەوەی بزانین بەسەر نەچون.

پێنجەم: بونی ئاگر كوژێنەوە لەناو هەموو ئۆتۆمبیلەكاندا.

شەشەم: دانانی ئاگاداركردنەوەی بونی مەترسی ئاگر لە بارەگاكاندا.

حەوتەم: نابێت بەنزیك بۆ هیچ كارێك لە ژورەكاندا بەكاربهێنن.

**هەشتەم: ڕاهێنان بۆ بەکارهێنانی ئاگرکوژێنەوە و چۆنێتی کۆنترۆڵکردنی ئاگر.**

**حەوتەم: پەیوەندی کردن بە لایەنی پەیوەندیدار لەکاتی بونی ئاگر.**

**ت- پلانی ئەرێنی**

**یەکەم: بەخێرایی چارەسەر بدۆزرێتەوە بۆ ڕێگەگرتن لە بەرفراوان بونی ئاگرەکە، باشترین چارەسەریش ئاگەدارکردنەوەی لایەنی پەیوەندیدار و، گرتنەبەری هەموو ڕێوشوێنە بەپەلەکان بۆ ڕێگری لە گەشەکردنی ئاگرەکە.**

**دووەم: هەڵکردنی ئامێری ئاگەدارکردنەوە.**

**سێیەم: کوژاندنەوەی کارەبا و ڕاگرتنی کارەکانی دیکە.**

**چوارەم: ڕێگر لەوەی نزیکی ئاگرەکە بکەونەوە.**

1. **کۆمەڵەی چۆڵکردن.**
2. **کۆمەڵەی پاسەوانی و پارێزگاری.**
3. **پاسەوانی نەهێشتنی ئاگر.**
4. **کۆمەڵەی ڕزگارکار.**

**پێنجەم: ئاگربڕ بۆ ئەوەی بەهیچ شێوەیەك ئاگرەکە بڵاو نەبێتەوە و سنورداربکرێت.**

**شەشەم: چۆڵکردنی بارەگا و ژورەکانی نزیکی ئەو شوێنەی ئاگریگرتووە و ئەگەر ئاگرگرتنی هەیە.**

**٥- پلانی نەهێشتن و بەگژاچونەوەی ئاگر**

**أ- بۆ ئەوەی پلانی کۆنترۆڵکردنی ئاگر سەرکەوتوبێت پێویستە ئەم ڕێگانە بگرینە بەر:**

**یەکەم: کۆمەڵەی کۆنترۆڵکردن.**

**دووەم: کۆمەڵەی پاسەوانی و پارێزگاری.**

**سێیەم: کۆمەڵەی چۆڵکردن و ڕزگارکردن.**

**ب- دیاریکردنی ئەرکی هەر تاقمە و بەپێی کارەکەی:**

**یەکەم: کۆمەڵەی کۆنترۆڵکردن.**

1. **کوژاندنەوەی ئاگرەکە کە بەربوەتە ناو بارەگاکە.**
2. **بەکارهێنانی ئەو شتانەی بۆ کۆنترۆڵکردنی ئاگر بە ئاسانی دێنە بەردەست.**

**دووەم: کۆمەڵەی ڕزگارکردن:**

1. **ڕزگارکردنی کەسەکان بە پلەی یەکەم.**
2. **بردنەدەرەوەی چەکەکان.**
3. **ڕزگارکردنی کەرەستە و مادەکانی دیکە.**

## وەرزی چواردەیەم

## ئامۆژگاریەكانی بەرگری ناوچەیی

١- **ئامانج**

بەرگری لە ئۆتۆمبیل و باڵەخانەی كاركردن لەلایەن كارمەندان و ئەفسەران و پلەدارەكانەوە و، پاراستنی تەواوی پێداویستییەكانی.

٢- **پیادەكردن**

أ- بۆ مەبەستی كۆنترۆڵكردن و دابینكردنی پاسەوانی پێویست بۆ باكورو باشور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوا و، هەروەها تەواوی چەك و كەرەستە و میلاكاتی فەرمانگەكەت.

ب- دابەشكردنی سەرجەم ئەفسەر و كارمەندانی فەرمانگە بۆ ئەنجامدانی كاری خۆیان.

٣- **كاروباری گشتی**

أ- بەلایەنی كەمەوە مانگی یەكجار پلانی بەرگری ناوچەیی ئەنجام بدەن.

ب- پێویستە شوێن و سەنگەر و كیسی خۆڵەكان بپشكنیت و وئامادەی بكەیت بۆ ڕوبەڕوبونەوەی هەر هۆكارێك كە كاریگەریان لەسەر دروست دەكات.

ت- هەماهەنگی لەگەڵ یەكەكان و فەرمانگە سەربازییەكانی درووپشتت و نزیكەكانت.

## وەزری پانزەیەم

## ڕاسپاردەکانی ڕێنمونی لەناوبردن

١- **گشتی**

بەوپێیەی دامەزراوە سەربازییەکان فەرمانگەی بەکارهێنەرن و پێویستیان بە پاڵپشتی ئابوری تەواوی دەوڵەتە لە بوجەی تایبەت و کەرەستەی خزمەتگوزاری، پێویستە ئەم ڕێنمونیانە بگرینە بەر:

أ- ڕێنمونی بەکارهێنانی ئاو

١- پاراستنی بۆریەکانی ئاو و چاککردنی ئەوانەی خراپبوون.

٢- چاککردنی بەلوعەکانی ئاو.

٣- داخستنی بەلوعەکان دوای بەکارهێنانیان.

٤- بەشێوەیەکی زۆر باش و ئابوریانە بەکاریان بهێنین.

ب- ڕێنمونی بەکارهێنانی کارەبا

١- بەکارهێنانی بەشێوەیەکی گونجاو.

٢- چاککردنەوەی ئەو وایەرانەی خراپبوون، ڕێگری لەدروست بونی شۆرت.

٣- بەکارنەهێنانی بۆیلەر لە نمرەی پێویستی خۆی بەرەو سەرەوە.

٤- کوژاندنەوەی تەواوی تەیارە کارەباییەکانی فەرمانگە دوای تەواو بونی ئەرك.

ت- ڕێنمونی بەرکاهێنانی سوتەمەن

١- دڵنیابیتەوە لەوەی سوتەمەنیت لە گەنجینەی گونجاو هەڵگرتووە.

٢- توندکردنەوەی پاسەوانی و ڕێگەنەدان بەدزیکردن لە سوتەمەنی.

٣- بەکارهێنانی باشترین جۆری پارێزگاری کردن و کۆنترۆڵکردنی.

ر- ڕێنمونی بەکارهێنانی پەڕاوگە و کەرەستەی نوسینگە

١- کۆنترۆڵکردنی ئامێری کۆپی کردن و و بەکارهێنانی کەرەستەکانی ناو نوسینگە.

٢- پارێزگاریکردن لەسەر ئامێری ئۆتۆمبیل و کۆنترۆڵکردنی و بەجوانی مامەڵەی لەگەڵ بکەیت.

٣- پرێنت نەکردن و کۆپی نەکردنی نوسینەکان تا تەواو دڵنیانەیتەوە لە دروستی و هەڵەگری تەواو.

٤- کوژاندنەوەی تەواوی ئامێرەکانی کۆپیکردن و کۆمپیوتەر دوای تەواو بونی ئەرکەکانت.

## وەرزی شانزیەم

## پشکنینەکان

١- **پشکنینی گشتی**

أ- **پشکنینی بەیانیان**

پشکنینی بەیانیان کاتژمێر (٨٠٣٠) هەموو ڕۆژێك لەلایەن ئەفسەری ئێشکگرەوە دەست پێدەکات و ئەمانە دەگرێتەوە.

یەکەم: پاك و خاوێنی پۆشاك و کەرەستەکانی بەکارهێنان و دڵنیایی لە تاشینی ڕیش.

دووەم: پاك و خاوێنی تەواوی بەشەکان و مشتەمەلات و هۆڵەکان.

سێیەم: پاکوخاوێنی تەواوی فەرمانگە و بەشەکانی دیکە.

ب- **پشکنینی ڕۆژانە**

بەڕێوەبەری بەشی میرە هەڵدەستێت بە پاکوخاوێنی بەشەکانی فەرمانگە و ژوری ئەفسەران و هۆڵی کارمەندەکان و سەرجەم دەشت شۆرەکانی فەرمانگە.

٢- **پشکنین حەفتانە**

هەموو پێنج شەممەیەکی حەفتە ئەمیندار هەڵدەستێت بە پشکنینی بەشەکان و دڵنیادەبێتەوە لەم بەشانە:

أ- هۆڵی نوسینگە و پێشوازی فەرمانگەکان و ئامادەکاری بۆ تەواوی پێدویستییەکانی فەرمانگە.

ب- ئامادەبونی تەواوی کارمەندانی نوسینگە و دڵنیابونەوە لەوەی کە کاری خۆیان دەکەن.

ت- دڵنیابون لە تەواوی کارەکان و دروستی کەرەستەکان و ئامادەباشی ئامێری کۆپی کردن و کۆمپیورتەرەکان و کەرستە پێویستەکانیان.

ژ- تەواوی ئۆتۆمبیلەکان و دڵنیایی لە گونجاندنیان بۆ سواربوون.

٣- <u>پشکنینی تایبەتی</u>

**بەڕێوەبەر خۆی پێی هەڵدەستێت لە ناو فەرمانگە و دەرەوەی فەرمانگە، ئەم هەنگاوانە هەڵدەگرێت:**

**أ- بەر لە چوار ڕۆژ لە ئەنجامدانی کاتی بڵاوکردنەوەی پشکنین دیاری دەکرێت و، بە فەرمانی فەرمی ئاگادار دەکرێنەوە.**

**ب- بەوردییەکی زۆرەوە هەڵدەستیت بە ئەنجام دانی پشکنین.**

**پ- نابێت هیچ کەس لەوانەی کە پێویستە ئامادەبن بۆ پشکنین لە فەرمانگە بڕۆنە دەرەوە تا پشکنینەکە تەواو دەبێت.**

## وەرزی حەڤدەیەم

## کاروباری گشت

١- هەموو ئەوەی کە لەم فەرمانانەدا هاتوون پیشاندان و خستنەڕوی بەردەوامە کە پێویستە نویێ بکرێنەوە و بەردەوام گرنگیان پێبدرێت لەهێزی پێشمەرگەی کوردستاندا.

٢- ئەتوانین لەکاتی پێویست و بەرەو پێشچونی کات بەشی دیکەی بۆ زیاد دەکرێت.

٣- ئەم فێرکارییە وەك نمونەیەك بۆ ئاسانکاری کارکردن لە بەشەکانی ناوفەرمانگە دانراوە.

٤- پێویستە سەرجەم کارمەندان لەدوای خوێندنەوەی ئەم فەرمانە جێگیرانە بەتەواوی پایەندی بن و کار بە ناوەڕۆکەکەی بکەن.